# ڕۆشنبیری نوێ



ژماره ۹۹ی ئەیلولی ساڵی ۱۹۸۳





سڵاوی گەرم بۆ سەرکردەی مەزنو
مێژوویی صدام حسین



# چاکەو خراپە لە بەراوردێکا

نوسینی : أ . ن . دڵسۆز

سەرگوزەشتو ڕووداوەکانی ئەم جیهانە ئەوەندەزۆرو لەمێژینو ، کۆنو پەرەدارە ، هەروەك دەریایێکی بێ بنوکەنارە ، کەبۆکەس ناناسرێتو نەناسراوە ، بەلاّم برێ جار ڕوداوی واگرنگ ڕووئەدەن کەمێژو ناتوانی بیان شارێتەوە وەلەبیری خەڵك ناچنەوە ، جا برێ جار ئەوروداوانە بەباری چاکیو خۆشیا تاقانەو گرنگن هی واشی هەیە لەبەرناخۆشیو نالەباری یانە ، کەلەبیری خەڵك ناچێتەوە ، دیارە ڕوداو دووجۆرە : هەیە دەستکردی دەستی مرۆڤ خۆیەتی هەیشە لەدەستی ئەودانیە وە بەدەستی سورشتە ، ئەوەی کەبەدەستی سورشتە ، ناخۆشەکانی وەك بومەلەرزە ، لافاو سوونوکوللە وشکەساڵی وەهەزاران بەلاّو ڕوداوی گرنگی‌ترە ، یان ڕوداوی خۆشی سورووشت وەك ساڵەباران ساڵی پیتوبەرەکەتی زەویوزار ، یان ئەم هەموە کانگەو بەرهەمو نیعمەتانەی کە لەم جیهانەدایەو مرۆڤ بۆسودی خۆی کەڵکیان لێ وەرئەگرێ .

**بەشی دووهەمی ڕوداوەکان** ، دەس کردی مرۆڤن وە سەر چاوەیان لەناخی دەرونی مرۆڤەوە هەڵئەقوڵێ کەلێرەدا ئەوەیان مەبەستی باسەکەی ئێمەیە ، ئەمانە ئەبنە دووبەشەوە بەشی چاکە بەشی خراپە ، واتە بەشی خزمەت بەئینسان وەئینسانییەت ، وەکەڵك گەیاندن بەمرۆڤ ، وەبەشی ناپیاوی وەزیانکاری ، کەئەویش دژایەتیە لەگەڵ ئینسانیەتدا ، وەزیاندانە لەمرۆڤ ، وەهەوڵدانە بۆ وێرانکاری .

ئەوەی کەکاری سورشتە ، ئەوە لەدەستی ئێمەدانیەو نازانین چەنوچۆنی بەچی یە وەکاری خوایە .

بەلاّم ئەمەی کەلەدەستی مرۆڤایە بێ گومان لەئێمەیەو بۆئێمەیە ، کەواتە نابێ هەروا بێ ئاوردانەوە بەلایانا تێ پەڕین وەبیانخەینە پشت گوێ .

ئەبێ ، بەچاك بڵێین چاکو ، خراپیش هەقی خۆی بەینەدەست .

لێرەدا دوومەبەست دێتە پێشەوە .

**یەکەمیان** : چاکەو خراپەکە خۆیەتی ، کەچین ؟ وەچۆنیان بناسین ؟

**دووهەم** : ئەوکەسانەن کە دەس ئەدەنە کارەکەو ئەنجامی ئەدەنو زۆروکەم دەوریان هەیە تیایا .

وەلاّمی یەکەممان ئەوەتە خراپە کردن کارێکی ئاسانەو درەختێکی ژاراوی یە کەزۆر زوو دێتە بەر ، بەلاّم چاکەکردنو چاك بوون وە ئاوەدان کردنەوەو بەرهەمی باش دان بەپێچەوانەی خراپ کاری وە وێرانگەری یەوە ، زۆر دێر دێتەبەرو بەنارەحەت دەس ئەکەوێ .

**بۆ نمونە** :

**مرۆڤێك** چەن ساڵی ئەوێ تابتوانێ بۆتی بسەلمێنی کەبەراستی دۆستی تۆیە ، یان بەراستی پیاوی چاکە یان بەراستی بەوێژدانە بەدینە بەشەرەفە ژیرە دڵسوزە ؟ وەهەزاران پرسیاری تری لەم جۆرە بێگومان هەم ماوەیێکی زۆری پێ ئەوێ هەم لێ بوردنو گوزەشتێکی زۆری پێویستە وەهەم سەرمایەیێکی زۆری ، ئاوەزو خوێنەواریو تێگەیشتنو پێ گەیشتنو ئازمونو تاقی کردنەوەی



ئەویت .

مرۆڤ ئەکریٚ دەساڵ چاکە لەگەڵ تۆ ، یان لەگەڵ خەڵك ، یان لەگەڵ وڵاتابکات ، بەلاٚم بەوتەیێکی ناشیرین ، بەکردەوێیکی ناپەسەند ، بەخەیانەتێك ، بەنادانانێك ، هەموی بدا بەئاوا .

یان سەبارەت بەوێرانکاریو بە ئاوەدانکاریش هەربەوجۆرەیە ، کەوێرانکاری ئاسانەو ئاوەدانکاری ئاساننیە ، باغێکی لای‌کەم دەساڵی‌ئەوەیٚ تابکرێتە باغو بەرهەمێك بدات ، بەلاٚم بەیەك‌ڕۆژ ، دە زەلامی‌تێخە هەموی ئەبڕنو وێرانی ئەکەن .

ئەم وێران کاریشە هەر هەوڵێکی بۆبدەی ناتوانی پینەی کەیتو جێگای بکەیتەوە ، ئایا کەس‌ئەتوانیٚ ، گوێزیٚ بەساڵێك بکاتە درەخت ئەگەر ملێونی دیناریش بدات ؟

ناء : چونکە پێویستی بەکات هەیە ، لەکاتێکا گوێزیٚ ، یان‌خورمایێکی پەنجاساڵە بەمشاری کارەبا ، بەدەقیقەیێك لەبنائەیبڕن .

کەواتە بۆیە چاکەو پیاوچاکی ، وەچاکەکردنو ماقوڵی ، ئەوەندە بەنرخە چونکە هەروا بەگاڵتە پیاو نابیٚ‌بەپیاو ، پیاو ئەبیٚ لەهەمو کاتو چەرخێکا ، لەخۆشی‌وناخۆشی‌دا ، لەدەسەلاٚت‌داریو بیٚ‌دەسەلاٚتیدا ، لەدەس‌چونو دەس‌نەچونا ، لەگەڵ دۆسو دوشمنا ، بەردەوام تاقی‌کرێتەوە ، وەهەمو ڕووەکانی ژیانی بخرێتەبەر زەڕرەبین ، وەبدریٚ لەبەردی « مەحەك» ، تابزانریٚ عەیاری چەندە ، دیارە بیٚ‌عەیب هەرنابیٚ ، بەلاٚم زێڕ کەعەیاری گەیشتە دوانزە لە بیستو چوار عەیارەکە ، ئیترکەس بەزێڕی دانانیٚ ، جاپیاو ئەوەنیە ، کەخاوەنی تەنهایەك هونەری پیاوەتی بێت ، بەڵکو **هەرچی ڕەوشی‌دیاری ، وە ئاواتی دەروونیو نادیاری‌یە ، کەئەوە بەرزو نزمی** ڕۆژگارە بۆمانی دەرئەخاتو«پێانی ئەسەلمێنیٚ» زیاترو پیاوانەترو چاکانە تربو ، ئەبێتە کەڵەمرۆڤی جیهانی مرۆڤایەتی ، بەجۆریٚ ئەگەر لەڕوانگەی ئاینی‌یەوە سەیری‌کەین ، وەك‌پەیامبەرانی لیٚ‌دیٚ ، یان پەیڕەوانی ڕاستەقینەیان ، ئەگەریش لەڕوانگەی مرۆڤایەتیو خزمەت بەمرۆڤەوە بێت وائەبێتە ئەدیسۆن ئەبێتەلینکۆلن ئەبێتە غاندی ، وەهەزاران کەڵەمێردی تری ڕێگای (ئیختراعو) خزمەت بەهێمنیو بەئاسایش .

کەلەدوورەوە پەنجەی بۆئەکێشن ، وەئەبێتە تیشکێکی ڕوناکی جاویدان لە مێژوی تاریکی مرۆڤایەتیدا .

لێرەدا مافێك‌هەیە نابیٚ‌بفەوتیٚ ، ئەویش مافی زۆرکەسانە کەئەگەر گەردوون هەلی بدایتە ئەوانیش وائەوانیش ئەبونە ئەدیسۆن یان لینکولن یان . . هتد بەلاٚم ، یان بەگەنجی تیاچوون یان دەس‌نراوە بەدەمیانا ، یان بۆی دەس نەداون ، هەروەها زۆر سەپانو هەژارو بیٚ‌دەسی وایش‌هەیە کە ئەودڵو دەرونەیان بەرادەی مرۆڤێکی پاکی‌ئاینی بیٚ‌غەشو بیٚ‌ئازارە ، بەلاٚم بەداخەوە کەی وەچۆن بکەوێتە بەردەسی زەڕنگەری‌ڕۆژگار تابناسرێن ؟ ئەمانە بەڕاستی ئەبنە « سەربازی گوم‌ناو» «الجندی المجهول» جا ئەبیٚ ئەوانەش لەبیرنەبەین .

کەوابو هەم خرابکاری زۆرئاسانە هەم ناپیاوی ، وەهەم خانووێیکی صەدنهۆم وەباغێکی‌پڕبەر ، وەکارخانەیێکی بەکەڵك ، ماوەیێکی زۆری‌پێویستە بۆ دروس‌بونو بەرهەم‌دان وەهەم پیاوچاکیو لاوچاکی وەمەردی‌وپیاوەتی ئەبیٚ لەکورەی ڕۆژگارا قاڵ‌بێتو ئەوچاکی‌وپیاوەتیە بسەلمێنی وەزۆرسەختە .

هەم وێرانکاریو ڕۆخاندنی ئەوباغوخانوە زۆرئاسانە هەم ناپیاویو دڵ‌ئیشاندنو جنێودانو دەس‌بڕی ، جاسەبارەت بەئاسانی وێرانکاریو خرابکاری ، وەسەختی وەگرنگی چاك‌بونو



ئاوەدانکاری ئەڵێین ، چوارساڵ لەمەوپێش گەلێك ، بەمێژوێکی کۆنەوە شۆرشی‌کرد تا لەدەستی زۆردارنو زۆرکاری خۆی‌دەربازکاتو دەستی‌بگاتە داوێنی ئازادیوسەربەخۆیی ، وەشەرەفو خۆشیو سەربەرزی بۆخۆی دابین‌کات ، گەلی‌ئێران بەهۆی ئەوەوە کەلەرادە بەدەر پابەندی ئاینو مەذهەب بوون ، زۆر بەئاسانی خەڵەتان وە خۆیان دابەدەستەوەو جڵەوی شۆرشیان دابەشی خومەینی‌یەوە ، کەبەهۆی دوورخرانەوەی لەوڵات ، ناوێکی‌هەبو ، ئومێدوئارەزوی ئەوگەلە ئەوەبو ، هەم خۆیان بگەنە خۆش‌بەختی ، وەهەم ببنەهۆی بەختەوەری گەلانی‌تریش .

بەڵام بەڕاستی هەم گەلی ئێران ئەوجێگائومێدەیان بویە کانگەو سەرچاوەی نائومیدیو ناکامیو کوێرەوەری ، وەهەم رژێمەکەش بویە « کتکە نەوتینەو » دینانێکی بەخۆیەوە سوتاند ، بەڕاستی ئەوەی خومەینی لەم چوارساڵەدا بەگەلی ئێرانی‌کرد نەهیچ دوژمنێ ئەیکاتو نەهیچ تاعوونو ئاوڵەو بەڵاێیکی‌ئاسمانی ! ! ! ! ئیستە ئەگەر ئەم‌خوێن‌مژە هەر بەکوشتنوبڕینی ئێرانیەکان قنیاتی بکردایەتو داکەوتایێ ، هێشتا هەر جێگەی شوکرو پینەوپەرۆکردنی هەبو ، بەڵام بوەتە ئاگرو بەریش‌بوەتە وڵاتەکەی ئێمەش لاوانی‌کوشتین خوێنی‌ڕشتین ، لەکۆڵ‌نابێتەوە عارنانێ ، بۆچی ؟ چونکە چی‌لەوە .

تەمەنی لەهەشتا تێپەڕیوە ، خۆی‌خزاوە تەکونێ دەستی چولەکەی ناگاتێ ، کوڕوکچی نابنە قاورمە ، دینەکەشی کردوەتە ئامرازی دەس‌بڕینی هەژاران .

بەڵام خەیاڵی خاوە عێراق وڵاتێکەو گەلێکی تیایە کەئامادەن بۆئەوەی هەمیشە مستەکۆڵەی بتەو بدەن بەناودەمی دەس‌درێژکەرانا ، ئێمە ژێری‌باری دەوڵەتە گەورەکانی جیهان نەچوین ، ئیستە نۆرەی‌ئەوەتە ببینە کۆیلەو موستەعمەرەی خومەینی ، ؟

ئەوڕۆژەش زۆر نزیکە کەگەلی ئێران هەروەك لەشا ، راپەڕین لەخومەینیش راپەڕن وەگۆڕی‌کەن ، گەلی‌عێراقیش چۆن پەنجاساڵ روبەڕوی ئیستیعمار وەستا وەچۆن سی‌ساڵە ئەدا لەناودەمی خومەینی ۳۰ ساڵی‌کەش خومەینی سەری‌بدا لەدیوار هیچی‌بۆ ناکرێ ، وە ئەم گورگەهارە ئەگەر تەمەنی لەچل‌ڕۆژ تێپەڕیبی لەچل‌مانگ‌تێ‌ناپەڕێ ئاخرەکەی هەر گۆڕ ئەکرێ .

لێرەدایە ئەبی بڵێم خرابەکردنو وێرانکاریو ناپیاوی ئاسانە ، وە لە دەستی هەمو نامەردێ دێ ، بەڵام چاکی وەچاکەکردنو بەدەس‌هێنانی ناوچاکی ، بەگاڵتە نایێتەدەست .

خومەینی بەم‌کارە پەستو ناشیرینانەی لەگەڵی ئێرانیەکانو لەگەڵی ئێمەشا ، نەفرینێکی بۆخۆی تەرخان کردوە کەهەتا هەتایە لەیادی مێژوناچێتەوە هەرچۆن کەناوی پیاوچاکان بەرن ، خێرا ئەوچاکانەمان دێتەوەیاد کەناومان بردن ،

هەروەها لەئایندەشا ، هەرکە باسی ناپیاویو خوێن‌مژی وە وێرانکاری‌یان‌کرد خێرا ناوی خومەینی دێتەوەپێش‌چاو ، خێرا ئەوشوورەییە دێتەوە یادی خەڵك کە خومەینی هاوردی بەسەر ناوی خاوێنی ئیسلاما وەناوی خومەینی لەتەنشتی ناوی هولاکو چەنگیزوتەیمور وهیتلەرا تۆمار ئەکرێت بەڵام ناوی ئەم گەن‌ترو پیس‌ترە ، چون بەناوی ئیسلامەوە ئەم‌کەتنەی‌کرد .

# خۆپیشاندانە فراوانەکەی ئەورووپا دژی خومەینی‌و ئاوردانەوەیەك لە رابردووی ئێران



سەلام

چەند رۆژێك پێش ئێستا لە تێکرای شارە گەورەکانی ئەورووپادا خۆپیشاندانی فراوان سازکراوە بە بۆنەی تێپەڕبوونی دوو ساڵ بە سەر کارەساتە خوێناوی‌یەکانی ئەم دوواییەی کوردستانی ئێراندا ، لە هەمووشی دیارتر خۆپیشاندانەکانی ، لەندەن‌و پاریس‌و ستۆکهۆڵم‌و بەرلین رۆژئاوابوو کە لە لایەن تێکرای هێزە خێرخوازو پێشکەوتووەکانەوە پشتگیری لێ کراوەو بەشداریان تیادا کردووە .

ئەمە هەواڵێکەو بە خێرایی لە رۆژنامەکاندا ئەیخوێنینەوەو لە ئێزگەکاندا ئەیبیستین ، بەلاّم کە لە سەری رائەوەستین‌و شی‌ئەکەینەوە گرنگی ئەو خۆپیشاندانەمان لە دوو لایەنەوە ، ئەکەوێتە پێش‌چاو :-

یەکەم : یەکگرتنی هەموو هێزێکی مرۆڤ پەرست‌و رزگاری‌خواز لە جیهاندا دژی ئەو کارەساتە خوێناوی‌یە جەرگ‌برانەی لە ئێراندا روودەدەن .

دووەم : رسواکردنی سیاسەتی مەلاکانی ئێران لە تۆقاندن‌و بەکارهێنانی توندو تیژی‌و زەبروزەنگ دژی گەلانی ئێران وەکو ئاشکراشە ، ژمارەکەی زۆر لە هاونیشتمانیە ئێرانیەکان سەبارەت بەو سیایەتە چەپەڵە بۆ وڵاتەکانی رۆژئاواو ئەمریکا هەڵاتوون‌و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی رووخانی رژێمە گەنیوەکەی خومەینی ئەکەن هەتا بە سەربەرزی بۆ وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە .

لە ئەورووپاشدا دەورێکی گرنگ ئەگێڕن لە رسواکردنی رژێم‌و تێگەیاندنی رای گشتی جیهانی لەوەی ئەمڕۆ لە ئێراندا روودەدات بە جۆرێك هەموو هێزە پێشکەوتن خوازو نیشتمان پەروەرەکان پشتگیری‌یان ئەکەن‌و یارمەتی‌یان ئەدەن .

سازکردنی خۆپیشاندانیش بە بۆنەی تێپەڕبوونی دووو ساڵ بەسەر رووداوە جەرگ‌برەکانی کوردستانی ئێراندا ، هەڵچوونێکی کاتی‌و بەرزکردنەوەی دروشم‌و لافیتەی رەنگاو ڕەنگ نییە بەڵکو سەرەرای گەلی کورد ، هەروەها هەموو گەلانی جیهان‌و ئێرانیش گەیشتوونەتە ئەو راستی‌یەی کە بە درێژایی ئەم چەند ساڵەی حوکمرانی خومەینی‌و دەست‌و پێوەندەکانی یەك پارچە کوردستان بۆتە گۆرەپانی شەرێکی خوێناوی‌و جەردەو جەللادەکانی ئێران هەرەشە لە بوونی گەلێك ئەکەن بە درێژایی مێژوو لە خەباتی بێ‌وچاندایە دژی زۆرداران‌و داگیرکەران ، بەمەیش مەسەلەی کورد لە ئێراندا قەوارەیەکی فراوانی وەرگرتووەو لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا دەنگی داوەتەوەو سەرنجی رای گشت بە لای خۆیەوە راکێشاوە .

ئەوانەی بەشداری‌یان لەو خۆپیشاندانەدا کردووە بە تەنیا کوردی پەرەوازەو ئاوارە نەبوون ، بەڵکو هەموو هێزە نیشتمان پەروەرەکانی ئێران‌و گشت هێزێکی ئازادی خواز بووە کە لە ڕێگای رێکخراوە سیاسی‌و پیشەیی‌یەکانەوە بەشداری‌یان تیادا کردووە چونکە ئەوەی چاوەڕێ ئەکرا پاش دەرکردنی محەمە رەزا شاو پەیدابوونی خومەینی بەخشینی مافی ئۆتۆنۆمی‌یە بە گەلی کوردو کۆتایی هێنان بە باری دژروارو ناهەموار ، بەلاّم ئەوەی روویدا دەق بە پێچەوانەی بیرکردنەوەو بۆچوونی گەلی کوردو گەلانی ئێران‌و هەموو جیهانەوە بوو ، ئەوەتانی لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی حوکمرانی مەلاکانی ئێراندا بەردەوام کوردستان بە ساروخ‌و گوللەی تۆپ ئاوەدان‌کراوەتەوەو هەر لە رۆژانی یەکەمیشەوە لە روی ئابووری‌یەوە گەمارۆ دراوەو هەموو توانایەك خراوەتە کار بۆ لێدانی بزووتنەوەی شۆرشگێرانەی گەلی کوردو لە ئەنجامیشدا تواندنەوەو نەهێشتنی ئەو گەلە کە خەونێکی (پەمەیی ! !)یە لە خەونە (بەهەشتی)یەکانی خومەینی فەتاح فاڵ .



بۆ ئەم مەبەستەش ئاینی ئیسلام کراوەتە دەمامك و رووپۆش چونکە بەلای کاربەدەستانی ئێرانەوە هیچ گەلێك بۆی نییە داوای مافی نەتەوەیی بکات وەك ئەوەی ئاینی ئیسلام خۆی لە خۆیدا نەتەوە بێت بە بێ ئەوەی ئاور لەوە بدەنەوە کە داوا کردنی مافی رەوای گەلان هیچ پەیوەندی‌یەکی بە ئاینەوە نییە سەبارەت بەوەی کە ئایین پەیوەندی‌یەکی روحی‌یە لە نێوان مرۆڤ و خوادا ، هەروەها گشت ئایینە ئاسمانیەکان ، لە سەروی هەموویانەوە ئاینی ئیسلام باوەڕی بە چەوساندنەوەی هیچ نەتەوەو گەلێك نییە .

لە راستیشدا دەمێکە ئەوە ساغ بۆتەوە کە لە بنەڕەتدا خومەینی و کاربەدەستانی لە سەر بنچینەیەکی ئاینی هەڵس وکەوت ناکەن بگرە مرۆڤ سەری سووڕدەمێنێ لەوەی کاتێ هەوڵ ئەدات ئەم تاقمە نافامە بە باوەڕێك یا ئایدۆلۆژیەیێکی تایبەتی‌یەوە ببەستێتەوە چونکە هیچ سەرو بەرێکی باوەڕو ئایدۆلۆژیەتیان دیار نییەو بێجگە لە رژێمێکی بەرەڵلای پڕ لە ئاژاوە هیچی تری نایەتە پێش چاو .

ئێمە لە کاتێکدا ، لە سەر ئەو خۆپیشاندانەی لە ئەوروپا دژی خومەینی سازکراوە رائەوەستین ئەوەش دەخەینەوە یاد کە دەیان خۆپیشاندانی لەو بابەتە لە ناوجەرگەی ئێراندا رێکخراوەو هەموو شارەکانی گرتۆتەوەو ملێونەها هاونیشتمانی داخ لە دڵ و بێ دەرەنانی تیادا بەشدار بووە ، هەروەها چەند جارێکیش خۆپیشاندەرەکان کوێرانە دەسرێژکراون و هەزاران لاشە لە سەر جادەکانی تاران و تەورێز و هەمەدان و مەهاباد و سنەدا خەڵتاوی خوێنی سوور بوون و تەنانەت لاشەکانیشیان نەدراوەتەوە کەس و کاریان .



# پاشی سێ ساڵ شەر
# سەرکەوتن‌و سەربەرزی هەمیشە
# هەر بۆ عیراقی مەزنمانە

کاروان دەرواو عیراق خۆشەویست هەنگاوی پر لە هیواو پێشکەوتن‌و سەرفرازی خۆی دەنێ‌و میللەتی مەزنی عیراقیش کەوا سێ ساڵە لە لایەن خۆفرۆش‌و نۆکەرانی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستانەوە شەری بە سەردا سەپێنراوە بەو پەری تواناو سەرکەوتن‌و لە خۆبوردنەوە کاردەکات‌و تێ‌دەکۆشێ‌و بەرهەم دەدات‌وبەرگری لە سەربەرزی‌و لە پێشکەوتن‌و سەربەستی‌و ئەو دەسکەوتانە دەکات کە لە ماوەی سەرکەوتنی شۆرشی ١٧ – ٣٠ ی تەموزەوە وەدەستی‌هێناوە .

بەلێ . . کاروانی . . سەرفرازی‌و گەشەسەندن‌و کار بەو پەری برەوووشکۆداری‌یەوە لە لایەك دژی ئیمپریالیزم‌و زایۆنی‌و خۆفرۆشان ناوچەکەوە باڵی خەباتی بێوچانی لێ‌هەڵکردووەو بە هیچ رەنگی بواری بێ‌بار نالەبارو کۆنەپەرست نادات کە خاکەکەی پیس بکات‌و هەرەشە لەسەربەخۆی‌و ئەو دەسکەوتانە بکات کە لەم چەند ساڵانەدا لە سایەی شۆرش‌و سەرکردایەتی شۆرشەکەیدا دەستی کەوتووە .

هەموو کەس زۆر باش ئەوە دەزانێ کە عیراق قەلایەکی ئازادیخوازان‌و گەلانی جیهان‌بوو لە ناوچەکەداو ئەو هێزەبوو کە ئیمپریالزم‌و زایۆنی بەو پەری ورەبەردان‌و ترسەرە لێ‌ی‌تۆقیبوون‌و بە هەموو رەنگی تەقەللای ئەوەیان داوە کە زەفەری پێ‌بێنن‌و لێ‌ی‌دەن . .

ئەم ترسە بوو کە وای لێ‌کردن زایۆنی‌یە درندەکان‌و خۆفرۆش‌و نۆکەرەکانی ئیمپریالیزم لە ناوچەکەدا هان‌بدەن بۆ ئەوەی هێرش بەرنە سەر لوبنان‌و لە گەلی لوبنان و گەلی ئازاویخوازی فەلەستین بدەن‌و رژێمی مەلاکانی ئێرانیان راست‌کردەوە کە شەر بە عیراق بفرۆشێ‌و هێرش بهێنێتە سەر سنووری عیراقی خۆشەویستمان . . بەلام گەلی کوردو عەرەب گەلی دەسکەوت‌و گەشەندووی عیراق . . گەلی پەروەردەی شۆرشی ١٧ – ٣٠ ی تەموزی مەزن . . گەلی برایەتی‌و کار . . گەلی بەرگری کارو عیراق پەرست . . گەلی شەیدای شۆرشەکەی‌و دەسکەوت‌و سەرکردایەتی‌یەکەی‌و لەسەرو هەموویانەوە هاورێ صدام حسین . . گەلی دڵسۆزی خاك‌و نیشتمان‌و سەرکەوتن . . هەرگیز دەسەپاچەو دەسە ئەژنۆدا نەنیشتوەو فێریش نەبووە دانیشێ . . لەبەر ئەوە هەر خەیاڵی کە رژێمی رەگەزپەرستی ئێران‌و ئیمپریالیزمی ئاغای‌و کۆنەپەرستانی ناوچەکە دەیکەن بۆ ئەوەی لە عیراقی خۆشەویستمان بدەن هەمووی خاوەو خەیاڵی ئەو کەسانەیە کە بە ئەندێشە دەژین‌و لە دڵسۆزی میللەتی عیراق بەرامبەر بە سەرکردایەتی‌و نیشتمانەکە نەگەیشتوون‌و . . ئەندێشەی ئەو کەسانەیە کە دلێری‌و یەکێتی عیراق نازانن کە چیە . . بۆیە هەر هێرشێ دەیکەنە سەریان دەیدات بە شورایەکی پۆلایی سەختداو لوتیان جار لە دوای جار زیاترو توندتر دەشکێ . . هەر شەکاوەبێ ئالای بەرزی عیراق .

به سەرکردایەتی حزب‌و شۆرش
و لە سەرووی هەموویانەوە
سەرەکی فەرماندە بەرێز صدام حسین
سەر شۆری وزەلیلی بۆ دوژمنانی عیراق .

دڵپاك محمود

پێشکەش بێ
بە جەنگاوەرانی ناو سەنگەری
نیشتمان پەروەرانی کورد دژی رژێمی
ئێرانی نابەسەند .

هونراوەی
هادی عمر محمد امین

# ئەمرین لە ریگای سەرکەوتن دا

-١-

کاتێك . . سەنگەرێك چۆڵ دەبێت . . !
چەن شەهیدێك . .
گیانی پاکیان . . لتوپۆیان
بەدڵی خەڵکا دا نەچۆرێ
لەدەفتەری نەمراندا . . ،
لە کاروانی شەهیداندا . . ،
جێگە دەگرێ

خوێنی پاکیان . .
کە ئەرژێتە نیشتمان
گەوهەر بۆ سەر خاك ئەبارێ
بۆسکی برسیو . . منداڵان . .
لەجێی تفو لەجێی تەرزە
نان ئەبارێ

ناوی شەهید . . زۆر پیرۆزە
لەسەر بەردی . .
بناغەی ژیان دەنوسرێ
لەهەموو شوێنێکی پیرۆز
ناوی دەبرێ

-٢-

کاتێك سەنگەرێك چۆڵدەبێت . . !
هەزارانی مەشق کردوو
عەشق گرتوو
رێگە دەگرێ

بۆ ئەوەی سنگی شەق بکرێ
بۆئەوەی گەلو نیشتمان . .
لەژێرپێی داگیرکەراندا
پێشێل نەکرێ
نەسوتێنرێ

دەبا زنجیری دەبابە
گیانی . . هەنجن هەنجن بکات
لە گۆشتو ئێسکی بچەقیو
چیتر دووژمن هەنگاو نەنێ
هەنگاوی داهاتووی ببرێ
پارێزگاری نیشتمان . .
بەگیانو بە بروا دەکرێ

-٣-

کاتێك . . سەنگەرێك چۆڵ دەبێت
نێرومێ گشت رێگە دەگرێ
قەڵای زۆرداری . . داگیرکەر
خۆی لەبەر هێرش ناگرێ
ئەروخێنرێ

-٤-

ئێمە خاوەن بیروبڕواین
چەندین ساڵە کۆشش ئەکەین
قەڵای زۆرداری تەختەکەین
بانی رەشی داگیرکەران . .
پەر ئەکەین

هەموو ئەڵێین . . سوێند بەو خاکەی
مایەی ژیانو نەمانە
بەشیری پاکی ئەو دایکەی . .
پەروەردەی کردین لە ژیانا
سوێند بەهەموو دڵۆپێ خوێن . .
رژاوی گیان شەهیدانە
سوێند بە گیانی ئەو خوشکانەی
کەجەڵ لە چکەی شانیانە
سوێند بە چاوی ئەو چاو جوانەی
لە رووی دووژمن قینو ژانە
سەنگەر لای ئێمە چۆڵ نابێت . .
بۆ سەرکەوتن هەموو ئەمرین
ئەمرین لەرێ ئەمژیانە

لە کۆتایی میهرەجانەکەدا بەریز مصلح جەلالی سەرۆکی دووەمین میهرەجانی رۆشنبیری و هونەری کوردی بە ناوی دانیشتوانو هونەرمەندانو رۆشنبیرانی کوردەوە ئەم بروسکەیەی خوارەوەی بۆ سەرۆکی فەرماندە صدام حسین بەرزکردەوە ، کە ئەمەش دەقی بروسکەکەیە :-

# بروسکەی بەشداراني دووەمين ميهـرەجـانی رۆشنبیری و هونەری کوردی بۆ سەرەکی فەرماندە صدام حسين

بەریز سەرەکی فەرماندە تێکۆشەر صدام حسين بەناوی هەموو رۆشنبیرو هونەرمەندانی کوردی بەشداربووانی دووەمین میهرەجانی رۆشنبیری هونەری‌ی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی‌یەوە کە لە ماوەی ٢٣-٢٨-٧-١٩٨٣ لە هەولیرو سلیمانی و دهۆك گیراوە بە بۆنەی کۆتایی پی‌هێنانی میهرەجانەکەوە ، کە بەراستی خۆپیشاندانێکی نیشتمانی بوو بەر لەوەی رۆشنبیری بێت بەتایبەتی کە لە چوارچێوەی ئاهەنگەکانی ولاتەکەمان بە بۆنەی جەژنەکانی شۆرشی پیرۆزی ١٧-٣٠ی تەمووزەوە گیرا راستگۆترین نموونەی خۆشویستن و وەفاداری بۆ بەریزتان بەرزدەکەینەوە .

بێگومان ئالای عیراقی‌یەکان بە سەرکەوتوویی بەسەر هێزەکانی ستەمگەرو دەستدرێژی کەردا بلندەبێتەوە کە لەگەل چەند کەسێکی سەرکێش لە خیانەتکاران ئەوانەی خۆیان هاویشتووەتە باوەشی ئیمپریالیەت و هەردوو رژیمی ئەسەدو قەزافی‌یەوە هەولیاندا خاکی عیراق پێشیل بکەن ، پەیمانیشتان پی‌دەدەین پەیمانی بەوەفایی کە بازووی کوردەکان شان‌بەشانی بازووی عەرەب خاکی نیشتمان دەپارێزن و لەرێ لادەرو بەکرێ گیراوەکان راودەنێن و هەموو درەختێك لە چیاکانی کوردستان‌دا دەبێتە نێزەیەك سنگیان کون‌دەکات .

نەوەی کوردەکان ئەوانەی هەمیشە لە پێشەوەبوون لە بەخشش و قوربانی‌دان‌دا بۆ بەرپەرچدانەوەی هەموو هەولەکانی ستەمگەری فارس و بێگانە هەر لە کۆنەوە لە داستانەکانی شارەزووری‌یەکان و پالەوانانی دمدمەوە بگرە تا دەگاتە داستانەکانی قەلادزێ و قەلاکانی حاجی ئۆمەران و لووتکەی گردەمەند ئەوان ئەمرۆ زۆر سوورترو بە تەووژم ترن بۆ پاراستنی نیشتمان و سەربەرزی و سەربلندی‌ی ، شمشێرەکانی عەرەب و کوردیش هەرگیز ماندوو نابن لە لیدانی دوژمنە چاوچنۆکەکان بۆ بەرگری کردن لە نیشتمانی خۆشەویست ، نیشتمانی دەستکەوت و بەدی هاتووەکان ، عیراقی مەزنمان لە ژێر ئالای سەرکردایەتی‌یە مێژوویی‌یە تێگەیشتووەکەماندا بەسەرەکایەتی‌ی خۆشەویستی کوردو عەرەب سەرەکی فەرماندە صدام حسين .

پێنووسە کوردی‌یە بەشەرەفەکان ئەم داستانی پالەوانێتی‌یە تۆماردەکەن بۆ ئەوەی بچێتە مێژووەوەو نەوە پاش نەوە بخوێنرێتەوە . .

ئەی سەرکردەی دانامان بۆ گەلی عیراق مەزن هەمیشە هەر بمێنیت و . . بۆ نیشتمانە سەربەستە سەقامگیرەکەت سەلامەت‌بیت .

**مصلح جەلالی**
**سەرەکی دووەمین میهرەجانی رۆشنبیری و هونەری کوردی**

# لەسایەی چەژنە پیرۆزەکانی تـــەموزدا ، دووەمین میهرەجانی رۆشنبیری و هونەری لە مەڵبەندی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان دەکرێتەوە .

لەکاتیکدا ، سەربازە دلێرەکانی سوپای عیراق مەزن بەدرێژایی سنووری وولات ، تۆماری سەربەرزی و مەزنی ئەم گەلە دەنەخشێنن و بەتایبەتی ئا لەم رۆژانەدا کە چیاکانی کوردستانی عیراق لەناوچەی حاجی هومەران بەدەستی بەچکە شێرانی کوردو عەرەب کرایە دۆزەخی خەونی چاوچنۆکی خومەینی و خۆفرۆشە نەفرەت لێکراوەکان . ئالەم کاتەدا گەلی کورد لەکوردستانی عیراق لە شارەکاندا لە ئاهەنگی سەرکەوتن و بیناکاریدا دەژی .

ئەوەبوو رۆژی ١٩٨٣/٧/٢٦ لە شاری هەولێر مەلبەندی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانی عیراق ، کاروباری دووەمین میهرەجانی رۆشنبیری و هونەری کوردی لە چوارچێوەی ئاهەنگەکانی گەلەکەماندا بەبۆنەی ١٥ ساڵ/ی بەرپابوونی شۆرشی ١٧-٣٠ تەموزی مەزنەوە ویادی چوارەم ساڵەی وەرگرتنی کاروباری پلەی یەکەم لە حزب و دەوڵەتدا لە لایەن سەرەکی فەرماندە صدام حسینەوە دەستی پێکردو ئەم میهرەجانە لەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی سازی کردەوەو تا (٢٩)ی مانگی تەموزی خایاندو هەردوو شاری (سلێمانی) و (دهۆك)یش گرتەوە .

شیاوی باسە جەماوەرێکی زۆر لەرۆشنبیران و هونەر دۆستان ئامادەی ئەم میهرەجانە بوون و بەشداریان تیاکرد . کردنەوەی میهرەجانەکە بە ووتاری مامۆستا مصلح جلالی بەرێوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەستی پێکرد . . . کە دەقی ووتارەکە لەلایەکی تردا ئەنووسرێ . . . هەروەها بەرنامەی میهرەجانەکە بریتی بوو لەم چالاکیانەی خوارەوە ، لە هەولێر :-

- پیشانگای نامیلکەکانی سەرەکی فەرماندە .
- باسێکی مامۆستا بکر محمود رسولّ دەربارەی تاقیکردنەوەی ئۆتۆنۆمی .
- کردنەوەی پیشانگای هونەری تەشکیلی .
- باسێکی مامۆستا د . جمال رشید دەربارەی لێکۆلینەوەی مێژوویی لە رۆژنامەی کوردیدا .
- باسێکی مامۆستا مستەفا نەریمان دەربارەی رەوتی رۆشنبیری کوردی لەسایەی شۆرشدا .
- کورێکی شیعر خوێندنەوە .
- باسێکی مامۆستا د . احسان فواد بەرێوەبەری گشتی خوێندنی کوردی دەربارەی پەرەسەندنی خوێندنی کوردی .
- باسێکی مامۆستا محمود زامدار دەربارەی نازناو لە زمانی کوردیدا .

– لە دهۆك :-

- پیشانگایەکی رۆژنامەی کوردی .
- باسێکی مامۆستا د . بەدرخان سندی دەربارەی ئەدەبی کوردی کۆچکردو صادق بهاءالدین .
- پێشانگای هونەرمەند صلاح گوهدار .
- ئاهەنگێکی هونەری .

– لە سلێمانی :-

- کورێکی شیعر خوێندنەوە بۆ لاوان .
- کورێك بۆ باسێکی مێژوویی لەلایەن بەرێز ئەحمەد خواجەوە .



# دەقی وتارەکەی مامۆستا مصلح جەلالی بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی لە کـــردنـــەوەی دووەمین میهـــرەجـانی ڕۆشنـبیری وهونەری کوردیدا

ئەی خوشکانی بەرێز

ئەی برایانی خۆشەویست ،

ئەی میوانە ئازیزەکان ،

لە ڕۆژانی جەژنەکانی تەمووزدا سلاوێکی شۆڕشگێڕانەو دڵسۆزانەتان پێشکەش دەکەم ، سلاوی ووشەی پاکی کوردیو هونەری کوردیو ڕۆشنبیری کوردی کە لە باخی نیشتمانی خۆشەویستدا دەگەشێنەوەو ڕۆژبەڕۆژ جوانترو بۆنخۆشتر دەبن . . سلاوی ڕەنجی دڵسۆزانو تەقەلای کاربەدەستانو خەباتی بەهرەداران لە جەماوەری کوردستان بۆ پەرەپێدانی خەرمانی هونەرو ڕۆشنبیری کوردیو بەرزکردنەوەی تەلاری شارستانەتی کوردی لە عیراقی خۆشەویستدا .

ئەی میوانە ئازیزەکان .

دەزگاکەمان دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی ئەمساڵیش میهرەجانێکی گەورەی هونەرو ڕۆشنبیری ڕێك دەخاتو مایەی شانازیمانە کە لەم ڕۆژگارەداو لەو هەوڵو مەرجەی ئێستادا بتوانین ئەم ئەرکە بەجێ بهێنین ، چونکە هێنانەدی ئەم کارە لەم ڕۆژانەدا چەند ماناو مەبەستێکی گرنگ دەگەیەنێ لەوانە :

١ – نرخ دانو قەدرزانینی ڕۆژە پیرۆزەکانی تەمووزە کە لەم ڕۆژانەدا قینی گەلی عیراق بەسەر داموودەزگای کۆنەپەرستیو دەرەبەگایەتیو سەر بە ئیمپریالزمدا تەقییەوەو شۆڕشی گەل قۆناخێکی نوێی لە ژیانی میللەتی عیراق بە عەرەبو کوردییەوە گرتەبەر کە قۆناغی بنیاتنانی ژیانی نوێو ئێستا مرۆڤی نوێو کۆمەڵی نوێیە .

شایانە ئەم ڕۆژە پیرۆزانەی تەمووز هەموو ساڵێك بە شانازییەوە یاد بکرێنەوەو ئاهەنگیان بۆ تەرخان بکرێت هەتا پشت بە پشتو نەوە بە نەوە لە مانا گرنگەکانی ئەم ڕۆژە مێژووییانە بگەنو بە دڵێکی پاكو بیرێکی ڕووناکەوە لە ڕەوتی کارو خەباتو تێکۆشاندا گەرمترو دڵسۆزانەتر هەنگاوی ڕاپەڕین بۆ پێشەوە هەڵێنین لە ژێر سەرکردایەتیی شۆڕشی پیرۆزدا .

ئیتر لەم ڕۆژانەدا لە سەرتاپای عیراقدا دەکرێت بە ئاهەنگو دارشتنی بەردی بناغەی کارو کردنەوەی پرۆژەی تەواوکراوو نواندنی چالاکی هونەریو ڕۆشنبیریو زانستی لە لایەن دەزگاکانی میللیو دەوڵەتەوە . ئنجا ئەم میهرەجانەی ئێمەش بەشداری دەزگاکەمانە لەم چالاکیو ئاهەنگانەو خۆمان بە بەختیار ئەزانین ئەگەر بتوانین لەم ڕووەوە بەرهەمێکی پەسەندو شایان پێش کەش بکەین .

٢ – هەر لەم ڕۆژە پیرۆزانەی شۆڕشی تەمووزدا دەمانەوێ گەرموگوڕیو گیانی بزووتنەوەو پێشکەوتن بەبەر ڕەوتی کاروانی هونەرو ڕۆشنبیری کوردی بدەینو جوولانەوەکە پتەوترو قووڵتر

بکەین ، پشتگیریی هونەرمەندانو نووسەران بکەینو یارمەتیی بەرزکردنەوەی بەرهەمەکەیانو دەرخستنی ناوو دەنگیان بدەین .

جا لەم بۆنەیەدا ، ئارەزووومانە ، میهرەجانەکەمان ببیّ بە خۆپیشاندنێکی گەورە لەسەرانسەری کوردستاناو لە ئەنجامدا ببێتە هۆی گەرم کردنی گیانی بەرهەم هێنانو بەهرەنواندنو ببێتە مایەی پیّناسینو تام لیّوەرگرتنی هونەرو ئەدەبو رۆشنبیریی لە لایەن جەماوەرانی کوردمان لە کوردستانەوە .

بیّگومان ئێوە ئەزانن دەزگاکەمان لە مەیدانی هونەرو ئەدەب بە تایبەتیو رۆشنبیریی بە گشتیدا تا ئێستا چالاکانە بازووی هیمەتی لیّهەڵمالیوە ، بە رۆژنامەو گۆڤارو کتێبو نامیلکەو پۆستەرو پەخشنامەکانیەوە ، بە کۆر و کۆبوونەوەو میهرەجانەکانەوە ، بە پێشانگا جۆربەجۆرەکانییەوە توانیویەتی بیسەلمێنیّ کە لە مەیدانی خزمەتیو گەشانەوەو پەرەپێدانی رۆشنبیریی کوردیدا دەستێکی باڵای هەیەو هەمیشە لە لاپەرەکانی مێژووی دوورونزیکدا بە گەشی بۆی توماردەکرێت .

٣ – ئێمە کە لە رۆژانی جەژنەکانی تەمووزدا میهرەجانی هونەریو رۆشنبیریی کوردی رێك ئەخەین ، ئەمانەویّ بەشداریی خۆمانو گەلی کوردمان لەو قەوماوە مێژووییەدا پێشان بدەین کە ئەمرۆ عیراق توشی هاتووە ، ئەویش جەنگی رەوای قادسییەی صدامە کە بەرگریی پاڵەوانانەی گەلی عیراقە لە دژی هێرشی دەستدرێژیی رژێمی خومەینیی دواکەوتووی کۆنەپەرستی دژ بە شارستانیو پێشکەوتن هێرشی دەمارگیریی دواکەوتنو تەماعکاری بۆ سەر خاکی عیراقی راپەریوی پێشکەوتنخواز ، هێرشی دەستدرێژیو دەست خستنە ناو کاروباری سەربەخۆیی عیراق بە هیوای لەتلەت کردنی یەکێتیی نیشتمانیو هەڵگیرسانی ئاگریی تایفەگەریو دەمارگیری ئایینیو نەتەوەیی . .

ئەی خوشكو برا بەرێزەکان

ئەی میوانە خۆشەویستەکانمان ،

بۆیە ئێمە لە یادی جەژنەکانی تەمووزی سەرکەوتنو بنیاتنانو کارو کۆشش داو لە رۆژانی یەکگرتنی پاڵەوانانەی گەلی عیراقو ئامادەیی تەواویانو لەبەردەم دەستدرێژیی کەراندا ، ئێمە ئاهەنگ دەگێرین ، مەشخەڵی ووشەو هونەری کوردی لە ئاسمانی عیراقی خۆشەویستدا بەرزدەکەینەوە ، ئێمە زیاتر شادمان ئەبووین ئەگەر چالاکییەکانمان هەموو شارەکانی کوردستانی بگرتایەتەوە ، بەلام بە پێی توانا هەوڵماندا لە مەڵبەندی پارێزگاکانی هەولێرو سلێمانیو دهۆکدا چالاکی بنوێنن لە شاری



سلێمانیدا (ئێوارە دانیشتنێك) دەکەین بۆ شیعر خوێندنەوەو گویّ لە ووتارێکی مێژوویی مامۆستا ئەحمەد خواجە ئەگرین لە شاری دهۆکیشدا ، مامۆستا د . بدرخان سندی ووتارێك دەربارەی بەرهەمو چالاکییەکانی خواڵیّ خۆشبوو صادق بهاءالدین پێش کەش دەکات ، هەروەها پێشانگایەك بۆ هونەری تەشکیلی رێك ئەخەینو ئاهەنگێکی گۆرانیو مۆسیقاش ساز ئەکەین .

لە شاری هەولێریشدا کۆمەڵیّ ووتار دەربارەی رەوتی رۆشنبیریو پەرەسەندنی خوێندنی کوردیو مافەکانی گەلی کوردمان لە سایەی شۆرشدا پێشکەش ئەکەین هەروەها پێشانگایەك بۆ نیگارو وێنەی هونەرمەندان ئەکەینەوەو پیشانگایەکی تایبەتیش بۆ ئەو کتێبو نامیلکانە تەرخانە ئەکەین کە سەرەکی خۆشەویست هاوریّ صدام حسین نووسیوونیو دەزگاکەمان کردوونی بە کوردیو ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان لیّ چاپو پەخش کراوە .

هەر بەم بۆنەیەشەوە ، رۆژنامەی هاوکاریو گۆڤاری (بەیان) و گۆڤاری (رۆشنبیری نویّ) سەرو ژمارەیەکی تایبەتی رازاوەو رەنگاو رەنگو جوانیان لیّدەردەچێت کە نمایشێکی ئاهەنگەکانی تەموز پێشان ئەدەنو بە شیعرو بەخشانو لێکۆڵینەوەو وتار باسی رەوتی بەرەوپێش چووی رۆشنبیریی کوردو باری سیاسیی دامەزراوی کوردو بەشداری گەل لە جەنگی

کۆمەڵە و یەکێتیو دەزگای میلییو دەوڵەتی لە بواری هونەرو ئەدەبو رۆشنبیریدا لە سایەی شۆرشی ١٧–٣٠ی تەموزدا راپەرینێکی تەواو گەورەیان بەدیهێناوە ، چەندین تیپی شانۆو مۆسیقاو هەڵپەرکێو هونەری فۆلکلوری کاردەکەنو چەندین گۆڤاری نایاب لە بواری پیشەگەرییو ئەدەبیاتو سیاسەتو هونەردا دەردەچن ، لەسەر ئەرکی دەوڵەت بەرهەمی نووسەران چاپ ئەکرێتو دەستگیرۆیی ئەدیبان دەکرێت بۆ بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان .

رۆژنامەگەریی کوردی هەنگاوێکی ئێجگار گەورەی هەڵێناوە . بەڵکو دەتوانین بڵێین بازێکی گەورەی داوە لە سایەی شۆرشدا مایەی شادمانی ئێمەیە کە یەکەم پێشانگای رۆژنامە نووسیان لە بەغدا کردەوەو ئەمساڵیش دووەم پیشانگامان سازکرد کە بەراستی بەژمارەو بەجۆرو چەشن ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی پێشاندا کە روژنامەگەریی کوردی لە سێبەری شۆرشدا پیی گەیشتووە .

کورد حزبو کۆمەڵەی سیاسیو کۆمەڵایەتیی خۆی هەیەو بە مافی ئۆتۆنۆمی گەیشتووەو سەرەرای هەموو پیلانو یاخی بوونێکی بەکرێ گیراوانو هەوڵو تەقەللای شای گۆربەگۆری ئێرانو دامودەزگاکانی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم ، یاسای ئۆتۆنۆمی جێبەجێ کرا کە بەرهەمی بەیاننامەکەی یازدەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ یەو لە هەموو جیهاندا دەنگی دایەوە کوردی گەیاند بە مافی رەوای نەتەوەیی خۆی لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتووی پێشکەوتووی بەهێزدا . . ئیتر وا ئەمرۆ دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمی بە ئەنجومەنی یاسدانانو ئەنجومەنی راپەراندنەوە خەریکی کارکردنو هەوڵو تەقەللای خزمەت کردنی گەلی کوردمانن لە کوردستاندا . ئەو بارەی گەلی کوردمان لە هیچ لایەنو بوارێکەوە بەراورد ناکرێت لەگەڵ باری کوردەکانی ئێرانو شوێنانی ترکە کوردی تیا دادەنیشێ .

کوردی ئێران تا ئێستا لاپەرەیەك بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا ناخوێنێو لە سادەترین مافی رۆشنبیریو سیاسی خۆی بێبەشە گەلی کوردمان لە تۆڵەی داواکردنی مافی نەتەوەیی رەوای خۆی کە بەڵگەنامەی مافی مرۆڤ (وثیقە حقوق الانسان)ی نەتەوە یەکگرتووەکان دیاری کردون تووشی ماڵوێرانیو کوشتنو برینو دەربەدەریێ دەبنو بە هەزارەها رۆڵەیان لە مەیدانی شەرەفو سەربەرزی نەتەوەییدا خوێنی گەشیان رشتووەو بەهەزاران ماڵو خانەوا دەربەدەرو



رەوای· قادسیەی صدامدا ئەکەن .

ئەوەی ئێمە کردوومانەو ئەیکەین بەشێکی کەمە لەو قەرزەی ئەدەینەوە بەرامبەر بە وەفادارێمان بە شۆرشی ١٧–٣٠ تەموزی مەزن ، چونکە بە راستی شۆرشی پیرۆزی تەمووز گۆرینێکی گەورەو دیاری لە بینای ئابووریو فیکریو رۆشنبیریو کۆمەلایەتیو پیشەسازیو کشتوکاڵی میللەتی عیراقدا بەدیهێناوە ، گەلی کوردیشیان کە گەلی دووەمی ئەم نیشتمانی عیراقەیە هەنگاوی زۆر گەورەو گورجی هەڵێناوە لە رێی پێشکەوتنو بووژانەوەو پەرەسەندندا لە هەموو مەیدانێك لە مەیدانەکانی ژیاندا . . لە سایەی شۆرشدا گۆرینێکی باش بەدیهاتووە لە بواری ئاواکردنەوەو خانووبەرەو کۆشكو تەلاروبینای هەمە جۆری قوتابخانەو زانستگاو دەزگای دەوڵەتیو میریدا . . . رێگاوبانی تازە بەناو دوڵو نشێوو لوتکەی شاخەکاندا درێژبوەتەوەو دێهاتی دوورو لا چەپو ناوچەی سەختی بە شارەکان بەستۆتەوە خزمەتی کۆمەلایەتیو تەندروستیو شارەوانیو پرۆژەی هەمە جۆری کشتوکاڵیو پیشەسازی هەموو لایەکی کوردستانی گرتوەتەوە ، خوێندن بە زمانی کوردی پەرەسەندنێکی تەواوی بەخۆیەوە دیوەو مایەی شانازیی هەموو کوردێکە زانستە جۆربەجۆرەکانی وەکو فیزیاو کیمیاو ماتمانیك جگە لە شعرو ئەدەبیات بە کوردی ئەخوێندرێ .

سەرگەردان بوون . . تا ئێستا کار بەدەستە خوێنڕێژە دواکەوتووەکانی ئێران بەچاوی نەتەوە سەیری گەلی کوردمان ناکەن‌و دان بە بوون‌و بە مافی ڕەوای نەتەوەییاندا نانێن .

لە کاتێکدا لە عیراق دوای شۆڕشی ١٧–٣٠ی تەمووزی ١٩٦٨ سەرکردایەتی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی توانی گەورەترین‌و ئاڵۆزترین گیروگرفت‌و سەخت ترین کۆسپ لە ڕێگەی پێشکەوتن‌و پەرەسەندنی عیراقدا تەخت بکات ئەویش مەسەلەی نەتەوایەتی بوو ئەوەبوو شۆڕش هەوڵێکی تایبەتی‌ی دلسۆزانەی‌دا لەم ڕێ‌بەداو بەیاننامەی یازدەی ئازاری ١٩٧٠ی جاڕداو قانوونی ئۆتونومی بۆ ناوچەی کوردستان داناو مافی ڕۆشنبیری تورکمان‌و سریانەکانی بڕیاردا . بەم جۆرە بناغەی یەکێتی‌ی نیشتمانی پۆلابەند کردو لەسەر ڕێبازێکی زانیاری بەڕێگەی ئاشتی‌و دیموکراتی مەسەلەی کوردی بنەبڕ کرد .

یەکێتی‌ی نیشتمانی لە عیراقدا وەنەبێ هەر دروشمێکی سیاسی‌و بانگەوازێکی جاروبار بێت . بەڵکو ئەم یەکێتی‌یە مەبدەئی‌یەو ڕەگی مێژووی دووری یەکسانی نیشتمان داکوتاوە .

ئەگەر سەیر بکەین دەبینین ڕێبازی حزب‌و شۆڕشی ١٧–٣٠ تەمووز لەم ڕووەوە زۆر ڕوونەو هەموو عیراقیەکان وەك یەك دادەنێ لەماف‌و ئەرکداو لە هاونیشتمانیەتی‌و پاریزگاری کردن لە وولاتداو لە شەرەفی خزمەت‌و ئیش کردندا لە هەموو مەیدانێکی ژیانداو دەستخستنی کارو فەرمان‌و پایەدا لە ناو دەوڵەتدا . دەستووری عیراقیش لە زۆر برگەو مادەکانیدا ئەم ڕاستییانەی جێگیر کردووە . ئەوەتانێ لە برگەی (ب)ی ماددەی سێ‌یەمیدا هاتووە :

«گەلی عیراق لەدوو نەتەوەی سەرەکی پێکهاتووە کە بریتین لە نەتەوەی عەرەب‌و لە نەتەوەی کورد . ئەم دەستوورەش دان بە مافی نەتەوایەتی کوردو مافە ڕەواکانی هەموو کەمایەتی‌یەکاندا دەنێ لە چوارچێوەی یەکێتی‌ی عیراقدا» .

بەم جۆرە تەلاری یەکێتی نیشتمانی لەسەر بناغەیەکی پتەوی سەربەخۆیی سیاسی‌و ئابووری‌و ئازادیی کۆمەلایەتی‌و لەژێر خێوەتی سەربەستی‌و دیموکراتی‌و برایەتی‌و خۆشەویستی‌و ڕیزلێگرتن لەناو گەلدا دامەزراوە . ڕۆژبەڕۆژیش پتەوی‌و قایمی‌ی ئەم یەکێتی‌یە ساغ دەبێتەوە ، چاکترین سەنگی مەحەکیش ئەم ڕووداوانەی چەند ساڵەی دوایی‌یەیە .

هەر لەو ڕۆژەوە ئیمپریالزمی ئینگلیز پێ‌ی نایە خاکی وولاتمان گەلی عیراق بەیەك دەست لە دژی وەستان‌و شۆڕشیان



کرد . دوای ئەویش لەسەر دەمی مەلەکی‌و حکوومەتی داردەستی بێگانەدا کریکارو جوتیارو خوێندەوارو سەربازو قوتابی‌ی کورد شان‌بەشانی برا عەرەبەکانیان لە مانگرتن‌و خۆپیشاندان‌و ڕاپەرینە خوێناویەکاندا بەشداریان کردووە . بە خوێنی پاکی ڕۆڵەکانی عیراق بەندەکانی پەیمانی پورتسموت لە ساڵی ١٩٤٨دا سڕایەوە وەخوێنی کورد لە شورشی ١٩٤١دا دژی ئینگلیز لە حەبانیەو سن‌الذباندا تێکەڵ بە زنجی بصرا بوو . بەندیخانەکانی نوری سعید پول پول تێکۆشەرانی کوردیان لەگەڵ عەرەبدا دەگرتە خۆو هەمیشە یەکێتی‌ی نیشتمانی چەکی خەبات بوو دژی داگیرکەرو داردەستەکانی لە حوکمڕاکانی عیراق سەردەمی پێشوودا زوربەی زورتان (ئەی یەکێتی نیشتمانی عیراق چۆن ڕەنگی داوەتەوە ، شاعیرانمان کە هەست‌و سۆزی دەروونی خەڵکی کوردیان وێنە کێشاوە ، لە شیعرەکانیاندا ئەوپەڕی دلسۆزییان بەرامبەر بە خاکی عیراق‌و گەلی عیراق پیشانداوە . زێوەرو بێکەس‌و پیرەمێردو گۆران‌و چەندین شاعیرو نووسەری گەورەی تر لە سەردەستەی ئەو ناوە پیرۆزانە



دێن که بەرهەمیان بۆ یەکێتی نیشتمان تەرخان کردووە .

ئەمرۆش شتێکی سروشتی یە کە ئەم دەورەی دوای شۆرشی ١٧-٣٠ی تەمووزی ١٩٦٨ گەورەتر بێت . چونکە شۆرش وەکو گوتمان پەیوەندیی نیشتمانی لەسەر بنەرەتێکی راستەو زانستانە دامەزراند . گەلی کوردیشمان توانی دەوری سروشتی خۆی بگێرێتەو بەگیانێکی تازەوە کە شورش بەدیهێناوەو خستوویەتیە ناو دەرووتی رۆڵەکانی . بەشداری بکات لە بیناتانی عیراقی نوێدا . ئەمرۆ نیشتمان پەروەری تەنیا ئاواتەو شیعرو پیاهەڵگوتن نییە بەڵکو نیشتمانپەروەری لای هەموو عیراقی یەك بوەتە هەستێکی قووڵ و بەزەبرو هەمیشەیی خۆشویستنی وولاتەو هەلویستی دڵسۆزانەو کارکردن لە پێناویداو قوربانی دان لە رێگەی سەربەرزیو سەربەخۆیی و سەلامەتی دا .

بۆیە لە رۆژگاری ئەمرۆدا کە گەردەلوولی کۆنەپەرستی ی چەرخەکانی ناوەراست دەیەوێ ئاسمانی سامالی عیراق بشێوێنێ و تەلاری یەکێتی ی نیشتمانی و دامەزراوی و ئاسایشی نێوان رۆڵەکانی عیراق بە هەموو ئاین و رەگەزو نەتەوەکانی یەوە تێك بدات . بۆیە لەم رۆژگارەدا کە هێزێکی بێگانە دەستی ناپاکی بۆسر خاکی عیراقاندا درێژبکات و دەستکەوتە مەزنەکانی گەل لەکار بخات و مافە رەواکانی گەلی کوردمان وون بکات دیارە کورد لەپێش هەموو رۆڵەکانی تری گەلی عیراق دەست دەداتە چەك و پارێزگاری لە نەتەوەکەی خۆی و گەل و نیشتمانی عیراق دەکات .

نووسەرو هونەرمەندو رۆشنبیرانی کوردیش کە رۆڵەی بەهەست و وریای ئەم گەلەن . پێویستە لە سەریان هەموو بەهرەو رەنجی فیکری خۆیان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی عیراق و قوولتر کردنی برایەتی نێوان میللەتی عیراق بەخت بکەن .

ئەوان پێویستە دڵسۆزانە بە دەنگی گەلەوە بێن و قەڵەم و کەرەسەکانی هونەریان بکەن بە چەك ئاراستەی گیانی دوژمنانی پێشکەوتن و ماف و سەربەخۆیی عیراق بکەن . پێویستە لە پێناوی دەستکەوتەکانی گەل تێبکۆشن ، پێویستە لە دڵ و ویژدانی گەلدا بژین . ئەو گەلەی بەخوێن و فرمێسك و سەرو ماڵ و سامان بەرگری لە عیراق دەکات ، ئەو گەلەی یەکێتی ی نیشتمانی بەهیچ چاوورا وێکی چاو خەڵەتێنی دواسنوور ناگۆرێتەوە . چونکە مێژووی عیراق هەر لە کۆنەوە ئەوەی ساغ کردوەتەوە کە یەکێتی ی میللەتی عیراق بناغەیە بۆ شکاندنی هەموو شاڵاوێکی بێگانە .

بەتایبەتی ئەم شەرەی کەوا خومەینیّ بە نیازی خراپ و تەماعکاری و کۆنەپەرستی بەسەر عیراق دا سەپاندووە .

بەشداریی شاعیرو چیرۆکنووس و رۆژنامە نووس و گۆرانی بێژو مۆسقا ژەن و وێنەکێش لە شەری قادسیەی صدامدا مایەی شانازی یە . لە رۆژنامەو لە گۆڤارەکان و رادیۆو تەلەفزیۆندا . لە کۆرو کووبوونەوە جەماوەری یەکاندا لە نێو کۆمەڵەو رێکخراوە میللی یەکاندا بەرهەمیکی زۆریان بلاوکردوەتەوەو بەشداریی گەلی کوردیان لەم ئەرکە پیرۆزەدا دوویات کردوەتەوە . بەلام چەندیان کردووە ، پێویستە زیاتریش بکەن و لە دوارۆژداو لەسەر لاپەرەکانی مێژوودا ناوی گەلەکەیان بە رووسووری تومار بکەن .

تکا لە برانووسەرو هونەرمەندو رۆشنبیریەکان دەکەم کە قووڵترو جوانترو زۆرتر بەهرەی نایابیان تێکەل بە هەست و سۆزی جەماوەرو رۆڵە بەجەرگە تفەنگ بەشانەکانی سەر خەتی ئاگر بکەن و دروشمی هەمیشەیان با ئەوە بێت « با هەموو شتێ لە پێناوی سەرکەوتندابێت » .



# کارەساتی دراوسێکانمان

احمد خواجه

لە چوارچێوەی دووەمین میهرەجانی رۆشنبیریو هونەری کوردیی دەزگاکەمان بەبۆنەی جەژنی تەمووزەوە ، لقی دەزگاکەمان لەسلێمانی کۆڕێکی مێژوویی بۆ مامۆستا ئەحمەد خواجە لەهۆڵی یەکێتیی نەقابەکانی کرێکارانی سلێمانی رێك‌خست . مامۆستای ناوبراو ئامادەبوو ، بەڵام لەبەر بێ‌تاقەتی لەجیاتی خۆی حەمەسەعید سەلیم بەگی هەژاری راسپارد ووتارەکەی بخوێنێتەوە کەوا لە خوارەوە پێشکەش بەخوێنەرانی بەرێزی دەکەین :

نیشتمانی ئێمە ، لە بەرەبەیانی مێژووەوە ، مەڵبەندی ئاوەدانیو نیشتەجێ‌بووەو لە چیاو دۆڵو دەشتەکانیدا کۆمەڵانی مرۆڤایەتی ئاوەدانیو شارستانەتیان بنیات‌ناوە ، خاکی نیشتمانەکەشمان هەر لەزۆر زووەوە کەوتۆتە بەر چاوتێبڕینی بێگاناناو رەوتی لەشکرەکانیانەوە ، زۆر جاریش بووەتە مەیدانی کێشەو زۆرانبازیی ئیمپراتوریەت‌و دەوڵەتەکانی ناوچەکە . توندو بەتەوژمترین کێشە کە سەردەمێکی زۆری خایاندو مێژوو کارەسات‌و ماڵوێرانیو کوشت‌و کوشتارو بەدکارییەکی زۆری لێ‌دەگێرێتەوە ، ئەو ماوەیە بوو کە کوردستان کەوتە نێوان گوریس کێشەکێی دەوڵەتی صفویو عثمانیەوە .

جا ئێمە لێرەدا هەندێ لە باسە گرنگەکانی حوکمدارانی ئەردەڵان‌و بابانەکان دەست‌نیشان ئەکەین ، لەگەڵ ئەو کارەساتانەی کەبەسەر کوردو کوردستان‌دا هاتووە ، بە تایبەتی لە ناوچەی شارەزووردا کەوا بە کورتی پێشکەشی ئەکەین .

کوردستان زۆر لە پیاوانی گەورەو دلێری خاوەن مێژووی‌پێگەیاندووەو بە درێژایی ژیانیان لە کۆشش‌و نیگاهداری خاك‌و خۆڵیان‌دابوون رۆڵەکانی کورد هەمیشە نەریت‌و دەستووری ژیان‌و مافی «گەلایەتی»ی خۆیانیان نیگاهدارکردووەو بە خوێن‌و کوشتار ، ماڵ‌سووتان‌و وێرانی بوونیان پاراستووە کورد زۆر شانازی بە هیمەتی دلێرانەو بەنیشتمانی خۆشەویستی خۆیانەوە ئەکەن‌و سەیری ئازایەتیو قارەمانی ئەکەن .

لە بیرم دێت ، دانیشتوانی شاری سلێمانی بەشی زۆریان بۆ گوێگرتن لە (شانامە) و نووسراوە جەنگییەکان‌و دلاوەریی پاڵەوانان بە درێژایی شەو بە چایخانەو قاوەخانەدا ئەسوورانەوە ، شەوێك لە شەوەکانی سەرماو کرێوەدا لەناکاو لەناو دانیشتواندا بوو بە هەراو خەنجەرکێشان لە یەکتر ، گۆیا لەسەر ناوی پاڵەوانێکی کورد کە ژێرکەوتووە بوون بە دوو بەش‌و پەلاماری یەکتریان دا ، هەر بەدوای ئەو رووداوانەدا (رازخوێن) (بە فارسی ئەم شیعرەی (فردەوسی) کە باسی فەرەیدون ئابایتن - یەکێك لە شاهەکانی پێشدادی ئەکات خوێندەوە :

تو بشنار کز مرزی ایران زمین
یکی مرد بنام ابـاتین
زو توخم کیانبود وبیدار بود
خیردمند و گرد بی‌آزاربود
زو تهمورس کورد بود نژاد
پدر بر پدر همی داشت یاد

کوردییەکەی :

تۆ بناسە کیشوەرو خاکی ئێران زەمین
لەو پیاوەوە کە ناوی بوو ئابـاتین
لە تۆوی کەیانبوو ، بە ئاگا بوو
مەردێکی ئازاو پاڵەوان‌و بێ ئازار بوو
لە تەهمورسی کورد بوو ئەژدادی
ئەژیا بەناوی باوو باپیری یادی

ئیتر خەنجەر بەدەستەکان دامرکانەوە . ئەم باسەش لە شاهەکانی پێشدادییە ، درۆو رێکخراوی ئەفسانەیی نییە ،

لەنەوەی کەیومورسی مەزنو تیرەی « ئاجام »ن وباسێکی مێژوویی سەرچاوەدارە .

کورد ، پێش‌هاتنی ئیسلام ، لەسەر ئاینو رەووشتی خۆیان بوون ، دوای ئەوەی ئاینی ئیسلام تیشکی بەسەر جیهاندا کێشاو دووبەرەکی ئاینیی شیعەو سونیەتی هاتە ناو ئیسلام زوربەی کورد بەسونیەتی مایەوەو رێگەی راستو پەرستشی ئاینی موسڵمانی‌یان گرت دراوسی‌کانی کورد لەلایەك دەوڵەتی عوسمانی بوو ، لەلایەکی ترەوە دەوڵەتی صەفەوی ئێران بوو ئەمانە لەسەر خاکی کوردستان هەمیشە لەکێشەدابوونو جارەهای جار شەری گەورە لە نێوانیاندا بەرپابووە عوسمانیو ئێران بۆ سەرکەوتن لەجەنگدا کە پەلاماری یەکتریان بدایە بێگومان کوردستان لە نێوانیاندا ئەکەوتە ژێر پێ‌و شێلان ، ئەوکاتەیش بە ناچاری کورد لایەنگریی لایەکی ئەکرد . ئەوسا ئەو هاوکارییە ئەبوو بە هۆی سەرکەوتنی ئەو بەشەو ماڵوێرانیو تێداچوونی کورد خۆیو ژێرباری هەمیشەیی .

### دەوڵەتی ئەردەڵان

بەپێی مێژوو لە ساڵی ٤٩٨/٦٣٠کدا لەلایەن قوباد ناو لەنەوەی شاهانی دەوڵەتی دۆستکی ، بە تێکۆشانو دانایی خۆی لە شاربازێرو شارەزووردا حکومەتێکی سەربەخۆی دامەزراند لە ساڵی ٦٥٦دا بەرامبەر بەلەشکرە بێ‌شومارەکەی هولاکۆ زانی خۆی پێ‌ناپارێزرێت خۆی گەیاندە لای « یەشموت » کوری هولاکۆ کە سەر لەشکر بوو . قوباد خۆشویست ناوی نا (بابا ئەردەلان) واتە بابە گەورەو ئازا .

پاش قوباد مەئموونی کوری بوو بەحوکمدار ئیتر شارەزوور بوو بە پێویستی هەرە گەورەی دەوڵەتی عوسمانی سوننەو ئێرانی شیعە بە تایبەتی لەزەمانی سولەیمانی قانونی دا کێشەی نێوان هەر دوو دەوڵەت توندو سەخت‌بوو لە هەردوولاوە دەست بەخوێن رژاندنی کورد کرا ، تا لەشکری ئێران پێی نایە سەرسنووری مەڵبەندی شارەزوور ، ئەوسا سولەیمانی قانونی دڵی کوردەکانی راگرتو لە ئەمانجامدا شاری حیللەی دا بە مەئموونو سروچكو کەرکووکی بەسمایل‌بەگ‌ر بەخشی .

کوردەکان بۆ پاراستنی وولاتەکەیان شەرێکی مەردانەیان لەدژی ئێرانی‌یە داگیرکەرەکان کردو توانییان زەبرێکی باشی لێ‌بدەن . خۆ لەسەردەمی (سەرخاب)ی حاکمی ئەردەڵان‌دا تەهماسب شا ساڵی دە هەزار تومانی زێری ئەدا بە حکومەتی ئەردەڵان ، ئەگەرچی ئەویش‌و هەموو شاهەکانی سەفەوی بە

فێستە سوورەکەیانەوە دەست‌بەرداری لەشکرئاراییی نەئەبوونو چاویان لە گرتنو وێرانکردنی کوردستان نە ئەترووکاند .

ئیتر مێژوونووسەکان بەسەیرەوە لە بەسەرهاتی کوردو کوردستان دواونو ئەڵێن کورد لە پێناوی پارێزگاریی خاكو ئاینی خۆیدا قارەمانانە تێکۆشاون ، شیعەکانی صەفەویی ئێرانیش بۆ دەستکەوتی خاکە بەپیتەکەی کوردستانو پەرەپێدانی مەذهەبی وبەرشتنی خوێنی بێ‌تاوانانو ماڵو دیهات سووتاندنو دەستی بەدکاری لە بەربەرەکانی وجەنگی خوێنیندا بوون . . کەچی صەفەوییەکانیش گوایا داوای ئاینی ئیسلامیان دەکرد !

ئێرانییەکان هەمیشە لەناوکاودا بەلەشکرو سوپای گەورەوە ئەیاندا بەسەر نیشتمانی کورددا ، ئەمەتا سولتان حسین صەفەریی شای ئێران هەڵیکوتایە سەر ئەردەڵانو شارەزوورو ئەو نامە پر هەرەشەیەی نووسیو ناردی بۆ سلێمان پاشا :

زنم اتش بکوردستان کەدود ازهند برخیزد
کشم تیغ حسینی‌را أمان أز روم برخیزد

کوردییەکەی :

ئاگرێك ئەنێم بەکوردستانەوە لە
هیندستان دووکەڵی بگەرێتەوە
تیغی حوسێنیت لێ‌رائەکێشم
تا لە روّم دەنگ بداتەوە

سلێمان پاشاش هەر بەشیعرو بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە :

زنم أتش بەایرانت أز أصفهان دود برخیزد
زبیم تیغ خونریزم صدای الحذر خیزد
شدم‌حارس بأین سرحد پناه این بروبوم
کشم تیغ سلیمانی پنان لطف یزدانم

واتە :

ئاگرێك ئەنێم بە ئێرانتەوە دووکەڵ لە ئیسپەهان بگەرێتەوە ، لە ئێشی تیغی خوێن‌رێژم دەنگ‌و هاوارتان بزرنگێتەوە ، ئێستا حارسم لەم سەرحەدەدا بەروبوومی لێ ئەپارێزم رائەکێشم تیغ و شیری سولەیمانی لە پەنای لوتفی یەزدانم .

ئەمجارەیش لە ساڵی ١١٢٣کدا شەری نێوان‌کورد وئێران دەستی پێ‌کردەوە ، ئەوەبوو سولەیمان پاشای دووەم چووە سەر ئێران لەشکری ئێرانی بەجۆرێك شکاندو پەرشوبلاوکردەوە مەگەر مێژووی صەفەوییەکان بتوانێت بەسەرهاتەکەیان یاد بکات . سولەیمان پاشا بەشیعر ئەم نامەیەی بۆ شای ئێران نارد :

جـــــادار کی‌خسرو خـــــراج‌گیر خـــــاقـــــانم
عـــــجـــــمرا زبـــــط سیف أرم سلیمان ابن سلیمانم
زنوك رمح خونـــربـــزم فـــلـك ألوده مـــیگردد
کـــه گیو بـــیژنو قـــارون نـــدارنـــد تـــاب مـــیدانم
بـــقـــیصر پـــنـــجـــه‌مـــیـــبازم بـــأیـــران تـــیـــغ میرانم
فـــرنگستـــان بجوشی سلمو تور أرم بـــنـــده‌ی خـــاك کـــردانم
زسم‌بـــادی پـــای من زمین درلـــرزه می‌أیـــد
اگر عـــمـــرم شود بـــاقی کـــه درمـــکـــر خـــراسانم

کوردی‌یەکەی :

جـێگری‌کـەی خـەسرەوو خـەراج سێنم لـە خـاقـان
بەزەبری شیر عەجەم گیرم سولەیمان کوری سولەیمانم
بـــە خوێنی ڕم گەردوون ئـــەکـــەم ڕەنگین
کـە گیوو بـیژەنو قـاروون نـەتوانن بـێنە مەیدانم
بـەپـەنجە بـازی لـە قـەیسـەر ، لە ئێران تـیغی میرانم ،
فەرەنگستان بەوێنەی سلمو‌تور (نەوەی ئاباتینی پێشدادی)

ئـــەسووڕێنم ، بـــەنـــدەی خـــاکی کوردانم .
لـــە هـــاژەی بـــای پـــێی من زەوی خۆی دێتـــە لـــەرزە
ئـــەگەر خوا بـــدات ژیـــانم لـــە بیری گرتنی خوڕاسانم .

پاش ئەم نامە پڕ لەهەڕەشەیە لەشکری ئێران تەفروتوناکراو تێ‌ی‌گەیاندن کە بەبیری پووچ کوردستانیان پێ‌ناخورێت وئێمە بە بیروباوەڕی خۆمانەوە ئەتوانین کوردستان بپارێزین لەبەرئەوە با دراوسی‌و دۆستی چاك‌بینو بەس .

ئەمجا پاش جەنگێکی خوێنین کە چەند ڕۆژێ خایاند لەشکری صەفەوی بەشکستەییەکی زۆر خراپەوە و بە پەرێشانی خۆیان گەیاندە ناو هەمەدان هێزە سەرکەوتووەکەی کیشوەری ئەردەلانو بابان پاش کۆکردنەوەی تالانە بەجێاوەکەی لەشکری صەفەوی هەر لە کرمانشاوە زەهاو ، سنە ، سابلاخ ، بانەی خستە سەر کیشوەرە ئازادەکەی خۆی .

## هێرشی نادرشا ۱۷۲۷ ز

لە تۆڵەی سەرنەکەوتنی لەشکرو سوپای ئێراندا نادرشا ئەمجارە بریاری گرتنی کوردستانو بەغدای دا . لە کورستانەوە پەلاماری کرماشانی دا بەلام پێش‌گەیشتنی نادر شا ، حسین قولی خانی سەرۆکی کوردی زرەنگەنە مەردانە کرماشانی گرت وەبە ئاسانی حکومەتێکی پڕ ئاسودەو بە دەستووری تێدا دامەزراند

لەشکرەکەی نادرشا بەتالانو کوشتنو سووتاندنی دیهاتی ئەو کوردانەی ئەکەوتنە سەر ڕێگای سوپاکەی درێغیان نەئەکرد ، تا گەیشتە توزخورماتوو وبارەگای لی‌دامەزراند ، بۆ تالانو خراپە لەشکری سوارەی گەیاندە نیزیك کەرکوك ، سەرەڕای بەدکاری دە هەزار ماڵی لە عەشیرەتی بەیات بەرەهەندەیی نارد بۆ خوراسان .

کەرکووکی‌گرت ، لەشکرێکی زوریشی لەرێگەی ئاغجەلەرەوە نارد بۆ گرتنی قەلای سورداش ، پاش ئەوەی ئەو کوردانەی ناچەکە بەسەروماڵەوە تێداچوون قەلای سورداش کەوتە دەست لەشکرە خوێن‌خوارەکەی نادرشاە ، نادرشا فەرمانی‌دا کە بەزوویی هەموو تفاق دانەویلەیەك کەلە شارەزوورا هەیە بسێنرێتو بەکۆکراوەیی بنێررێت بۆ ( جمع شار دیالە) .

**دواقسە** :

بەپێی داستانو نووسینی مێژوو زانەکان لەسەرەتای پشکوتنی چاوی ئادەمیزادەوە کورد لە دەستووری تیرەیی‌دا بەناوی ئەمارەت «ئاغایی ، بەگایەتی»وە بە ئازادی فەرمانڕەوایی یاسای ناوخۆیانەوە ژیاون تاسەرەتاو باوی ئیسلامی .

بەداخەوە ، لە هاتنەناوکایەی دووبەرەکی لە ئاینی ئیسلامدا بەرێگەی مەزهەبی ، ئاسوودەیی موسڵمانان کەوتە ناو ئاشووب‌و ئاژاوەو بەربەرەکانی‌و لەناوبردنی هیواو ئازادیی گەلی کورد . بە بۆنەی دەسەلاتداریی شاهیەتی صەفەوی لە ئێراندا ، بەبیری پەرەساندنی ئاینی‌و داگیرکردنی خاکی دراوسێ بەتایبەتی کوردستان بە تالانو سووتانو کوشتنی برایانی ئیسلام دەست‌پارێزییان نەئەکرد .

جا من لەو باوەڕەدا نیم کە هیچ نوسەرو مێژوو نووسێك بەرامبەر بەکەس یان گەلو دەوڵەتێك لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیایەتیدا دەستو دڵپیسی بەکاربهێنێ ، بەلام ئەمجاریش بەداخەوە ، جاران باوەڕپێکراوە ئاینیەکان لەناو گەلدا بەبێ ووچان بەچاوبەست‌و کاری جادووگەری لە کنەکردنی ئاشووب نانەوەدا بوونو هەمیشە بۆ تێکدانو خوێن‌ڕژاندنی سونی‌و شیعە لە کارو کەمیندا بوون .

بەلام ئێستا :

هەر چەندە هێشتا زەمانی ئەو جەردە بێ‌چەك‌و میکرۆبە ئایینیانە بەتەواوی نەبڕاوە ، ئێستا بەناوی (لا إله الا الله)وە خوێن‌ڕێژی بووە بە مۆدیلی چەرخی تازە .

# کاروانی رۆشنبیری کوردی لە سالآنی بیستەوە تاکو رۆژی ئەمڕۆمان



مصطفى نەریمان

رۆشنبیری کوردی لە سەرەتای دەرچوونی یەکەم کتێبی کوردی‌یەوە لە عیراقدا تا رۆژی ئەمرۆمان بە شێوەیەکی گشتی لە رۆژنامەو گۆڤارو کتێبی چاپکراودا خۆی ئەنوێنێت . رۆژنامەو گۆڤار یا ئەوەتا رۆژانەیە یا هەفتەیی وەیان مانگی‌و یان وەرزی‌یە وەلە لاپەرەکانیدا رۆشنبیری گشتی جۆر بە جۆر ئەگرێتە خۆی وەك ئەدەبی ، کۆمەلآیەتی ، پەروەردە ، زانیاری هەتا دوایی . . . هەروەها زۆر کەسیش لە نووسین‌و دەرهێنانیاندا بە شداری‌یان تیادا هەیە ، بەلآم (کتێب) زادەی بیری تاقە کەسێکەو یەك بابەتە نووسین ئەگرێتە خۆی‌و چارەسەری رووداو یان کارەساتێك یان جۆرە زانستێك ئەکات هەروەها (کتێب) شوێن‌و مەقامێکی گرنگی لە مێژووی رۆشنبیری هەر میللەتێکدا هەیەو بە بڕبڕاگەی پشتی رۆشنبیری ئەدرێتە قەلّەم ، ئێمەش لەم کورتە باسەماندا تەنها لە دەورو پشتی کتێبی کوردی دەسوورێینەوە بۆ ئەوەی باسەکەمان ئاسۆی فراوانتر بێ‌و جار بە جار پەنجە بۆ رۆژنامەو گۆڤارەکانیشمان رائەکێشین ، بۆ گەیشتنە ئەم مەبەستەش بە فراوانی لە نووکی نووکەوە دەست پێ‌ئەکەین ، واتە لەو ساوە کە یەکەم کتێبی کوردیمان لە عیراقدا کەوتۆتە ژێر چاپەوە ، ئەویش سەرەتای بیستەکان ئەگرێتەوە کە شۆڕشی عیراق هەلّگیرساو عیراقیان سەربەخۆیی وەرگرت‌و کوردیش لە چوار چێوەی ئەم خاك‌و نیشتمانەدا چارەنووسی بۆ دیاری‌کرا . لە بیستەکانەوە قۆناغ بە قۆناغ واتە دە سالّ بە دە سالّ لەگەلّ کاروانی رۆشنبیری کوردیماندا سەرئەکەوین تا ئەگەینە دوا رۆژی سالّی پاری رابووردوو واتە سالّی (١٩٨٢)ی زایینی لە بیستەکاندا دوو دلّسۆزی کورد بە شانازی‌یەدە جێ‌و مەقامی خۆیان لە مێژووی رۆشنبیری کورد دیاری‌کردوە ، یەکەمیان (حسین حوزنی موکریانی) یە ، کە یەکەم چاپخانەی هێنایە کوردستان‌و لە رەواندوز دایمەزراند ، بەو چاپخانەیە گۆڤاری (زاری کرمانجی) دەرهێنا ، هەروەها هەشت کتێبی بە قەوارەی (١٨٠) لاپەرە پێ چاپکرد ، دووەمیان (حاجي تۆفیق - پیرەمێردە) کە بە هۆی چاپخانەی (حکومەت - بلدیة - سلێمانی)یەوە پێنج کتێبی قەوارەی (١٦١)لاپەرە چاپ‌کردو هەر لەو سالآنەشدا لە سلێمانی لە کاتی فەرمانرەوایی شێخ محمودی حەفیددا رۆژنامەی رۆژی کوردستان‌و دیاری کوردستان دەردەچو . پاش ئەوەش رۆژنامەی (ژیانەوە) بلآوکرایەوە . بە سەر یەکەوە لە بیستەکاندا هەژدە کتێبی کوردیمان بە قەوارەی (٧٨٩) لاپەرە دەرچووە .

هەروەها لە بیستەکاندا نوێنەری سلێمانی لە مەجلسی مەبعوثاندا پایە بەرز (محمد ئەمین زەکی) لە دوو راپۆرتدا لە وەزارەتی مەعارف داوای کرد کە کتێبی قوتابخانەکانی هەرێمی کوردستان بکرێتە کوردی هەر لەو سالآنەدا نۆ نوێنەری کورد لە

مەجلسی مەبعوثاندا لە یەکی حوزەیرانی ١٩٢٨دا لە یادداشتێکدا داوایان لە وەزارەتی مەعارف کرد کە دائرەیەکی مەعارف بۆ ناوچەی کوردستان دابنرێت‌و خوێندن لە قوتابخانەکاندا بکرێتە کوردی‌و (دار المعلمین)ێکی تایبەتیش لەم هەرێمە بکرێتەوە .

ئەو نووسەرانەی کە لە بیستەکاندا ناویان لە ئارادا بوو ئەمانە بوون (ئەسیری - توفیق وەهبی - پیرەمێرد ، جەمال عرفان ، حاجی مستەفا پاشا - حسین حوزنی - سعید صدقي - حسین ناظم حەمدی - صالح زەکی صاحبقران) .

هەر لەو سالأنەدا (حاجی مستەفا پاشای یا مولکی) کۆچی دوایی کردو (جەمالّ عرفان) بە دەستێکی ناپاك کوژرا .

لە سی‌یەکاندا بزوتنەوەیەکی رۆشنبیری کوردو کوردستانی گرتەوەو بەم جۆرە خۆی نواندو ئاشکرا بوو :

١ - لە سلێمانی رۆژنامەی (ژین)و لە هەولێر گۆڤاری (رووناکی) بلاّوکرایەوە لە دوا ساڵەکانی سی‌یەکانیشدا واتە لە ساڵی (١٩٣٩)دا گۆڤاری (گەلأوێژ)ی هێژا لەکەلّ سەری دەرهێنا .

٢ - (یانەی سەرکەوتن) لە بەغدا دامەزراو بوو بە مەڵبەندی کۆبوونەوەی لاوان‌و رۆشنبیرانی ئەوسەردەمە .

٣ - لە مێژوودا (محمد ئەمین زەکی) مێژووی کوردو کوردستان‌و مێژووی سلێمانی بلاّو کردەوە (حسین حوزني موکریانی) یش سێ جزمی لە زنجیرەی مێژووی (ئاورێکی پاشەوە)و لەگەل ئەم کتێبە مێژوویانەی چاپ‌کرد (کوردی زەند - کوردو نادر شاە ، کوردی موکریانی) هەروەها (صالح قفطان) دیسانەوە لە مێژوودا (پەندی تەئریخی‌و بەراوردێکی تەئریخی) بلاّوکردەوە .

٤ - کوردی‌و مەریوانی (مستەفا صائب‌و تاهیر بە هجەت مەریوانی) لە بەغدا ، زنجیرە کتێبێکیان بە ئەوارەی (٨٩٦) لاپەرە چاپ‌کرد ، کتێبەکان ئەمانە بوون (دیوانی کوردی - دیوانی نالی - دیوانی سالم - دیوانی شێخ رەزای تالەباني - دیوانی حەریق - کتێبی گۆرانی - کتێبی یاری - هەموو کچێك چی بزانێ - خورشیدی خاوەر - گوللەیەك لە تاریکیدا - توتنەکەمان) هەروەها (دەستەی لاوان) بش (دیاری لاوان‌و یادگاری لاوان) یان بلاّوکردەوە .

٥ - لە چاپخانەی (ژیان)ی سلێمانی (١٠) کتێب بە قەوارەی (٤٦٩) لاپەرەو لە چاپخانەی (زاری کرمانجی) لە رەواندز (٩) کتێب بە قەوارەی (١٠٨٣) لاپەرەو لە چاپخانەی (مەریوانی) لە بەغدا پێنج کتێبی تر - خارجی زنجیرەی کوردی‌و مەریوانی - بە قەوارەی (٤٩٢) لاپەرە چاپکرا ، ئەبێ ئەوەش بزانین کە پیرەمێرد لە کتێبەکانی خۆی (مەم‌و زین‌و مەولەوی‌و دوانزە سواری مەریوان)ی چاپ‌کرد .

ئەگەر بە پێ‌ی بابەت بروانینە بەرهەمی سی‌یەکان دەبینین مێژوو کەلەبوورو فوکللۆرو زانست‌و ئەدەبی جۆر بە جۆریش گرتۆتەوە . لە سی‌یەکاندا ئەم نووسەرانە لە گۆرەپانی رۆشنبیری کوردی ناویان دەرهێنا (ئەحمەد موختار جاف ، ئیسماعیل حەقی شاوەیس ، براٖیم ئەحمەد ، بەشیر موشیر ، تاهیر مەریوانی ، حامد فەرەج ، حسین دزەیی ، رەفیق حلمي ، شاکر فەتاح ، صالح قەفتان ، عبد القادر قەرەحسنی حصاری ، عبد الکریم بیارە ، عبد الکریم هەکزی ، عبد الله بەگی گۆران ، عبد الله زێوەر ، عەلی باپیر ئاغا ، ع . و . نوری ، کەریم زانستی ، گیوموکریانی مەعرووف جیاووك ، محەمدی خالّ ، نوری شێخ صالح)و لە سی‌یەکانیش دا (حسین ناظم‌و حەمدی) کۆچی دوایی‌یان کردو (ئەحمە موختار جاف) بە دەستێکی ناپاك کوژرا .

لە چلەکاندا ئاگری شەڕی دووەمی جیهان لە بلێسەداندا بوو ، پرشی ئەو ئاگرە کاری کردە سەر کزبوونی بەرهەمی کوردی ، چاپخانەی رەواندز لەو شارە نەما ، لە چاپخانەی (ژیان)ی سلێمانی پیرەمێرد رۆژنامەی (ژین)ی بلاّو ئەکردەوە تەنها تاقە کتێبێکی پێ چاپ کرا ، ئەویش (کەمانچەژەن) بوو ، بە هۆی دلّسۆزی‌و کارامەیی کاربەدەستانی (گەلأوێژ) ەوە ئاگرە سوورەی شەڕکاری تێ‌نەکرد ، بە رێك‌و پێکی تا دوا ساڵەکانی ئەم ماوەیە دەردەچوو ، وەبۆ یەکەم جار لە سالأنی (١٩٤٨ - ١٩٤٩) لە بەغدا گۆڤارێکی سیاسی ب کوردی‌و عەرەبی دەردەچوو ، کە مامۆستا (علاء الدین سجادی) دەری‌ئەکردو نووسەرانی کوردو عەرەبی ئەو کاتە بەشداریان تیادا ئەکرد ، گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە)ش بۆ پرۆپاگەندەی شەڕ دژ بە نازیەت دەردەچوو .

لە چلەکاندا (ع . و . نوری) چوار کتێبی بلاّوکردەوەو شاکر فەتاحیش چوار ، رەفیق حلمیش بەرگی یەکەمی مێژووی ئەدەبی کوردی بۆ یەکەم جار دەرکرد لەم ماوەیەدا (ا . ب . هەوری) کتێبێکی شانۆگەری بە ناو (دلّداری‌و پەیمان پەروەری) یەوە لە چاپ‌دا .

هەر لەم ماوەیەدا لە کوردوستانی ئێران کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی

به سەرۆکایەتی (قازی محمد) دامەزراو لەو دەزگایەوە چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێك‌و دەیەها کتێب لە چاپدرا و ئەوەی زیاتر خەلکی ئەم دی‌و ئەو دیوی سنووری هەژاندبووەوە ، ئێستگە بێ تەلە بەهێزەکەی ئەم کۆمارە بوو ، بەلأم ساڵێکی پێ‌نەچوو فارسە خوێن مژەکان ئەو کۆمارە ساوایەیان لە ناوبردو (قازی محمد)و هەڤاڵەکانیان لە سێدارەدا .

هەروەها لە چلەکان سوێندخواران لە حەیفای فەلەستین ئێستگەیەکی کوردی هێزیان بۆ پرۆپاگەندەی دژ بە نازیەت دامەزراندو لەم ئێستگەیەدا خوالێ خۆشبوان (گۆران ، ڕەمزی قەزاز ڕەفیق چالاك) خزمەتێکی باشیان ئەکرد ، ئەو دوو لەگەڵ ئێستگەیەکی کوردی لە بەیروت‌و ئێستگەی کوردی بەغدا لەکۆڕی خزمەتکردندا بوون .

لە چلەکاندا ئەم نووسەرانەمان هاتنە سەر دنیای نووسین‌و بلاوکردنەوە (أ . ب . هەوری) – ئەحمەد شوکری ، ئەحمەد هەردی ، جەمیل بەندی ڕوژبەیانی ، حسین شێخ حمە مارف ، دلدار ، دلزار ڕەشید نەجیب ، ڕەفیق چالاك ، ڕەمزی قەزاز ، سەلأم ، عثمان خۆشناو ، علاء الدین سجادی ، عبد القادر حشمەت ، عبد الله عزیز ، کەریم ڕەندی ، محمد توفیق ووردی ، محمد حسن مەنگور ، محمد حسین بەرزنجی ، ع . ح . ب ، محمد رشدی دزەیی ، محمد صالح دیلان مەحمود ئەحمەد ، مستەفا نریمان ، ناهیدە شێخ سەلأم) .
ئەم نووسەرانەشیان لەم ساڵأنەدا کۆچی دوایی‌یان کرد .
(بابا عەلی بێدار ، حسین حوزنی موکریانی ، دلدار ، زێوەر ، ع . و . نوری صابری ، صالح زەکی صاحبقران ، فایق بێ‌کەس ، محمد ئەمین زەکی ، فایق بێ‌کەس ، محمد ئەمین زەکی ، مەلأی گەورە) . ئەوەی شیاوی باسکردن بێت بە سەریەکەوە لە چلەکاندا تەنها (٥٢) ژمارە کتێب چاپکرا بە قەوارەی (٤٠٥٤) لاپەرە واتە سێ‌یەکی کتێبی سی‌یەکانمان .

لە پەنجاکاندا بەرهەمی کوردی ساڵ بە ساڵ پتر دەبووو زۆربەی زۆری بابەتەکانی شیعرو ئەدەبیات بوون (ڕەفیق حلمي) جزمی دووەمی مێژووی ئەدەبی کوردی بلاوکردەوەو مامۆستا (علاء الدین سجادی) یش مێژووی ئەدەبی کوردی بە شێوەیەکی فراوان‌و لە سەر شێوازێکی پێشکەوتووتر لە کتێبێکی بەرگداردا لە چاپدا . مامۆستا (ڕەفیق حلمي) بۆ یەکەم جار لە مێژووی نووسینی کوردیدا هات شەش بەرگە یادداشتی سیاسی نووسیەوەو لە چاپدا کە دەربارەی بزوتنەوەی کوردی ساڵأنی بیستی



ئەخستە روو . کە شۆرش ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بەرپابوو . کەف‌و کوڵی پەنگ خواردوو لە سەر سینگی نووسەران بە جارێ تەقیەوەو دەست‌درایە قەڵەم ئەوی لە دڵدابوو لە سەرەتای شۆرشدا هەڵڕێژرا . لە یەکەم هەفتەی شۆرشی چواردەی تەمووزدا حەوت مامۆستای کورد یاداشتێکیان دا بە کاربەدەستانی شۆرش‌و تیایدا داوایان کرد کە بەرێوەبەرێتیەکی گشتی بۆ خوێندنی کوردی لە کوردستاندا دابمەزرێت‌و مامۆستا ڕەفیق حلمی بکرێتە بەرێوەبەری گشتی ئەو دەزگایەو خوێندنی کوردی لە پلەی سەرەتایی‌و ئامادەییدا بکرێتە کوردی .

لە ٢٦ تەمووزی ١٩٥٨ ئەم یاداشتە لە ڕۆژنامەی (البلاد)ی (رفائیل بطی) بلاوکرایەوە ، لە جیاتی ئەوەی کە حکومەتی شۆرش بێت وەلأمی یادداشتەکە بداتەوە هات ڕۆژنامەی (البلاد)ی داخست‌و هەندێ لەو مامۆستایانەی ئەو یادداشتەیان مۆرکردبوو ، خستیانە ژێر لێکۆڵینەوەو چاودێری‌کردنەوە بەلأم ئەو یادداشتە بوو بە بەردێکی بناغەو شێوەیەکی جەماوەری وەرگرت هەر لە (٢٨)ی تەمووزدا کە وەفدی کوردستان بۆ پیرۆزبایی کردن چووبوونە لای کاربەدەستانی شۆرش ، پشتیگریان لە هەمان داوا کردن کرد ئیتر لەو ساوە دامەزراندنی (مدیریەتی مەعارفی کوردستان) بوو بە دروشمێك لە هەموو لایەکی کوردستان بنجی داکوتا ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٩ حکومەت ناچار بوو (مدیریة گشتی مەعارفی کوردی) دابمەزرێنێت . دوا بە دوای ئەوەش لە شەقلاوەدا یەکەم کۆنگرەی مامۆستایانی کوردی پێك‌هات‌و گەلێك بریار بۆ وەزارەتی زانیاری ئەو حەلە بەرزکرایەوە . بەلأم هەر لەو

کۆنگرەیەدا لە سەر دوو برگە لە ناوخۆ بوو بە مشت‌و مڕێکی زۆر . ئەو دوو برگەیەش ئەوە بوو داوا بکرێ (مدیریەتی مەعارف کوردی) بکرێتە (مدیریەتی مەعارفی کوردستان)و هەروەها پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردا بکرێت‌و داوای یارمەتیان بۆ بکرێ لە حکومەتی شۆرش ، دامو دەزگای ئەو کاتە یەك تاقە بڕیاریان لە بڕیارەکانی کۆنگرەی مامۆستایان کورد جێبەجێ نەکرد بەڵام جەماوەری کورد بۆ داوا کردنی مافی خۆی لە حکوومەتی (قاسم) سووربوون مامۆستایانی کودستانیش بۆ داوا کردنی مافی رۆشنبیری لە ریزی یەکەمی خەباتدابوون .

لە پەنجا کاندا چەند رۆژنامەو گۆڤارێکی کوردی بە کوت‌و پچری بلاو ئەکرانەوە وەك (هەتاو) رۆژی نوێ ، هیوا ، روناهی ، شەفەق) .

لەم ماوەیەدا (یانەی سەرکەوتن)یش بۆ ماوەیەك بە شێوەیەکی نوێ هاتبوە کۆری خزمەتەوە هەروەها یەکەم رۆژنامەی سیاسی کوردی بە ناو (خەبات) ەوە دەردەچوو پاش ئەوەش رۆژنامەی (ئازادی) بلاوکرایەوە ، بە گشتی لە پەنجا کاندا (٢٨٦) ژمارە کتێبی کوردی بە قەوارەی (٢٨٤٢٩) لاپەرە دەرچوو ئەمەش دەکاتە نزیکەی دوو چەندانی کتێبی کوردی سالی سی‌یەکانمان .

بە پێی بابەتیش کتێبی لێکولینەوەی ئەدەبی‌و سیاسی کەوتە بەرچاو جگە لە لێشاوی شیعرو پەخشاو چیرۆك‌و فۆلکلۆر .

لە پەنجا کاندا ئەم نووسەرانەمان لە سەر گۆرەپانی نووسینی کوردی ناویان دەرهێنا (ئەنوەر مائی ، ئەمینی میرزا کەریم ، ئیحسان فۆاد ، بورهان دوغرامەچی ، بەکر دلێر ، پیریال مەحمود ، جەمال بابان ، جەمال نەبەز ، جەمال شارباژێری جیهان عومەر ، حەبیب عەلی میرانی ، حسین رشوانی ، حسین عارف ، خالد دلێر ، حسن مهی جاف ، صادق بهاء الدین ئامێدی ، عز الدین مصطفى رسول عبد الله میدیا ، عوسمان عوزێری ، فواد عزەت ، کاکەی فەللاح ، کامل بەصیر ، کامەران موکری ، کامل ژیر ، کەریم شارەزا ، عمر عبد الرحیم مارف خەزنەدار ، محرم محمد ئەمین ، محمد رشاد مفتی ، محمد عەلی کوردی محمد مزا ، محمد رەسول هاوار ، محمد سعید ناکام ، محمد صدیق عارف محمد صالح سعید ، محمد مولود (مم) ، محمدی مەلا کریم ، مستەفا صالح کەریم نوری عەلی ئەمین ، نوری وەشتی ، هۆگر گۆران) . ئەم نووسەرانەشمان لەو ماوەیەدا کۆچیانکرد (بەختیار زێوەر ، بێخود ، بیرەمێرد ، جەبار ئاغای کانی ، سەلام مەعرووف جیاووك ، نوری شێخ صالح) لە هەندەرانیشدا (جەلادەت بەدرخان ، محمد میهری ، محمد عەلی عەونی) .

گەلی کورد ئاواتی ئەوەبوو لە سایەی شۆرشی ١٤ی تەمموزەوە بگاتە ئامانجی رۆشنبیری خۆی ، بەلام ئەم ئاواتە نەهاتە دی‌و ئەوەبوو لە سالی ١٩٦٠ دووەم کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە گیراو جگە لە مامۆستایان گەلیك لە رۆشنبیری ناوداری کورد بەشداریان تیادا کردو بریارێکی زۆری تیادرا بۆ بووژاندنەوەی زمان‌و کەلەپووری کوردی‌و هەرچەندە وەزیری زانیاری لە کردنەوەی ئەم کۆنگرەیە بەشداری کرد بەلام کە بریارەکانی پێشکەش‌کرا ، ناوچاوانی‌دا بە یەکدا ماوەی ئەوەی نەدا ببرو رای ماموستایان بە سنگلێکی فراوان وەربگرێت .

ئەوە بوو سالێ وەنەچەرخاوە هێزەکانی قاسم هێرشیان بردە سەر کوردستان‌و لە یانزەی ئەیلولی ١٩٦٢وە کوردیش دەستی دایە بەرگری کردن لە ماف‌و بوونی خۆی ، ئتر هەر لەو سالەدا دەیەها مامۆستاو روشنبیری کوردی یا بەرەو خوار دوور خرانەوە ، یا خرانە کونجی بەندنجاوەو یاخود هەردوو پاداشتەکەیان وەرگرت ، بە راستی زۆربەی زۆری سالانی شەشتمان زۆر بە گران‌و سەخت بە سەرماندا تێپەری بەلام بە هۆی بەرگری کردنی گەلی عیراقمان بە گشتی‌و کوردە دلسۆزەکانمان بە تایبەتی‌و هێزە نیشتمانیەکان توانیان یەك لە دوای یەك قاسم‌و هەردوو عارف‌و دەست‌و دایەرەیان لە رەگ هەلبکێشن ئەوەبوو شورش جەفدەی تەمووزی سالی ١٩٦٨ بەرپابوو و شۆرشگێران لە ١٩٦٩/١٠/١٠ مافی روشنبیریان بۆ کورد ئاشکرا کردو دهۆك کرایە پارێزگاو بریاری دانانی زانکۆیەك لە کوردستان دراو زمانی رەسمی لە ناوجەکەدا بوو بە کوردی‌و خوێندن لە پلەی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی سەرەتاپا بریاری بە کوردی بوونی لە کوردستاندا درا هەر لەو سالانەشدا رۆژنامەی (برایی) و (رووناکی) دەرچووو دەزگایەکی رۆشنبیری کوردی دامەزرا .

لەو سالانەشدا گۆڤاری (بلێسەو هیواو رۆژی نوێ) لە دەرچووندا بوون . بە تێکرایی لە شەستەکاندا (٣١٨) ژمارە کتێبی کوردی بە قەوارەی (٣٥٧٩٣) لاپەرە چاپکرا . لە شەستەکاندا ئەم نووسەرانەمان هاتنە سەر دنیای نووسینی کوردی (ئەحمەد خواجە ، ئەحمەد سالار ، ئەحمەد رەشوانی ، ئەحمەد محمد ئیسماعیل ، ئەژی گۆران ، ئەمین پارەزانی ئەمین

موتابچی ، ابراهیم عمر ، بورهان قانع ، تاهیر صادق ، پاکیزه رەفیق حلمي ، جەبار جەباری ، جەمال جەلال ، جەمال شالی ، جەوهەر غەمگین ، جەمیل رەنجبەر ، حسن عەودالآنی ، حمه کەریم هەورامی ، عبد الرزاق بیمار عبد الله پەشێو ، عبد الله عباس ، عوسمان شارباژێری ، ع . ع . شەونم ، کاوس قەفتان ، کاکه مەم بۆتانی ، کەمال جەلال غریب ، رەئوف حسن زەکی هەناری ، ساجد ئاوارە ، شکور مستەفا ، شێرکۆ بێ کەس ، مەدحەت بێخەو ، مستەفا رابەر ، نەسرین فەخری) . ئەم نووسەرانەشیان لەو ماوەیەدا کۆچی دوایی‌یان‌کرد (ئەنوەر مانی ، بەشیر مشیر ، رەفیق حلمي سەعید کابان ، صالح قەفتان ، عبد الله گوران ، عبدالخالق ئەسیری ، قانع مستەفای حاجي مەلا رەسول ، نجم الدین مەلا ، نجم الدین حجي مەلا رەسول دوا ساڵی شەستەکان بناغەیەکی بتەوی بۆ ساڵی هەفتاکان دامەزراند ئەوە بوو له ١٩٧٠/٢/١٠ یەکیەتی نووسەرانی کورد دامەزراو ، دوا بە دوای ئەو بەیانی یانزەی ، ئاداری ساڵی ١٩٧٠ له لایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە بۆ ئاشکرا کردنی مافی کورد بلاوکرایەوەو ئاگری شەری برا کوژی له کوردستاندا کوژایەوەو ساڵ بە دوای ساڵ شۆڕشی حەفدەی تەمموز دەستکەوتی پێشکەش گەلی کورد کردو له ساڵی (١٩٧٤) یشدا ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دامەزرا . دوو ئەنجومەنی یاسادانان‌و راپەراندن هاتنه کایەوە ، به هۆی ئەم دەستکەوتنانەوە له هەفتاکاندا ئەم دەزگا رۆشنبیریەس کوردییانه کەوتنه چست‌و چالاکی‌یەکی ئەوتۆ که شوێن پێی خۆیان قایم کردو له مەیدانی رۆشنبیری کوردیدا خزمەتێکی بەرفراوانیان بەم جۆرە پێشکەش کرد :

١ - کۆڕی زانیاری کورد - ئەم کۆڕە له ١٩٧٠/٨/٣٠ دامەزراو له ساڵی ١٩٧٢ەوە دەستی‌کردە بەرهەم بلاوکردنەوە ، له ماوە هەشت ساڵدا واته تا دوا رۆژەکانی ساڵی ١٩٧٩ بوو به هۆی چاپکردن‌و بلاوکردنەوەی (٧٨) ژمارە کتێب به قەوارەی (١٦٨٢٩) لاپەرە که رێژەی صەدی دەکاته له ٢٤٪ کتێبی کوردی ئەو دەساڵەمان جگه لەمە کۆڕ هەشت بەرگه گۆڤاری به قەوارەی (٥١٤٤) لاپەرە له چاپداو بلاوی‌کردەوە .

لەم سێ ساڵەی دوایی‌بەشدا واته ١٩٨٠ ، ٨١ ، ٨٢ ، دەستەی کورد له کۆڕی زانیاری عیراقدا هەشت کتێبی به قەوارەی (١٦٤١) لاپەرە چاپکرد تێکرا کۆڕ له رۆژی دامەزراندنیەوە تا ساڵی پار (٨٦) کتێبی به قەوارەی (١٨٥٧٠) لاپەرە چاپکردووە .

٢ - دەزگای رۆشنبیری کوردی : له ١٩٧٠/٩/١٤ دەزگای رۆشنبیری کوردی دامەزراو بلاوکراوەی (رۆشنبیری نوێ) ی به عەرەبی‌و کوردی بلاوکردۆتەوە ، له (١٩٧٤) دەزگای (هاوکاری) دامەزرا ، له ساڵی ١٩٧٦ دا هەردوو دەزگاکه یەکیان گرت‌و ناوی لێنرا (دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی) لەو ساوە تا دوا رۆژەکانی ساڵی ١٩٧٩ لەو دەزگایەدا ئەم بلاوکراوانه دەردەچێ :

١ - رۆژنامەی (هاوکاری) هەفتەی جارێك .

٢ - گۆڤاری (بەیان) له ماوەی ئەم ده ساڵەدا (٥٧) ژمارەی لێ دەرچووە .

٣ - گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) یش له هەمان ماوەدا (٧٧) ژمارەی لێ‌دەرچووە .

هەروەها به هۆی دەزگای روشنبیری‌یەوە هەر لەو ماوەیەدا (٩١) کتێبی کوردی به قەوارەی (٩٤٥٢) لاپەرە دەرچووە ئەمەش به پێی رێژەی سەدی دەکاته له ١٩٪ ی کتێبه کوردی‌یەکانی ئەم ده ساڵە لەم سێ ساڵەی دوایشدا واته له ساڵانی ٨٠ ، ٨١ ، ٨٢ دا ئەم دەزگایه (٨١) ژمارە کتێبی به قەوارەی (١٠٢٣) لاپەرە چاپکردووە ، کۆی هەموو کتیبه چاپکراوەکانی دەکاته (١٥٨) کتێب به قەوارەی (١٩٥٨٥) لاپەرە .

٣ - ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری‌و لاوان له هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستاندا :

ئەم دەزگایه له ساڵی ١٩٧٧ دەستی کردۆته چاپکردنی کتێبی کوردی تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٩ بوەته هۆی چاپکردن‌و بلاوکردنەوەی (٣٠) ژمارە کتێب به قەوارەی (٣٠٣٧) لاپەرەدا ، ئەمەش به پێی رێژەی سەدی دەکاته له ٢ر٨٪ ی کتێبی ئەم ماوەیە .

له سێ ساڵەی هەشتاکانیشدا ئەم دەزگایه (٣٨) کتێبی به قەوارەی (٤٤٢٦) لاپەرە چاپکردووە ، کۆی ژمارەی هەمووی دەکاته (٦٨) کتێب به قەوارەی (٧٤٦٣) لاپەرە .

٤ - ئەنجومەنی یاسادانان : له ساڵی (١٩٧٧)ەوە ئەم ئەنجوومەنه دەستی کردووته چاپکردنی مەحزەری

کۆبونەوەکانی لەو ماوەیەدا . لە سێ بەرگە کتێبدا (١٦٤٩) لاپەرەی گرتۆتەوە ، جگە لەمەی گۆڤارێکی وەزری بە عەرەبیو کوردی بلاّوئەکاتەوە .

٥ – زانکۆی سلێمانی : یەکێکە لە بەرهەمەکانی شۆرشی (١٧)ی تەمووز ئەم زانکۆیە گۆڤاری (ئاسۆی زانکۆ)ی بلاّوئەکاتەوە ، جگە لەوەی گۆڤارێکی پسپۆری هەیە ، بەلاّم لە بلاّوکردنەوەی کتێبی کوردیدا لە سنورێکی تەسکدا دەجوولێتەوە ، بە جۆرێك لەم دە ساڵەدا تەنها پێنج کتێبی کوردی بە قەوارەی (١٢٥٠) لاپەرەدا چاپکردووە .

٦ – بەرێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی : لە یانزەی ئادار بەم لاوە لە ماوەی دەساڵدا ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە دەستی‌کردە ئامادەکردنی کتێبی کوردی نوێ بۆ پلەی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەیی .

لە مەیدانی یارمەتی‌دانی نووسەران بۆ چاپکردنی کتێبی کوردی ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە لە هەفتاکاندا بوو بە هۆی یارمەتیدانی (٨٧) کتێبی کوردی بە قەوارەی (٩٨٥٧) لاپەرە جگە لەوەی زنجیرەیەك کتێبی بۆ منداڵانو شانزدە ژمارەی گۆڤاری پەروەردەیی (پەروەدەو زانست) بلاّوکردەوە سەرجەمی ژمارەی ئەو کتێبە کوردی‌یانەی کە لەم ماوەیەدا دەزگا رۆشنبیری‌یە کوردی‌یەکانمانو دەزگاکانی تری حکومەت بوونەتە هۆی چاپکردنیان (٢٨٠) کتێبە بە قەوارەی (٤٢٨٢) لاپەرە ئەمەش بە پێ‌ی رێژەی سەدی دەکاتە ٤٩٪ی کتێبی کوردی چاپکراوی ئەو ماوەیە .

ئەگەر ووردی بروانینە بەرهەمی کتێبی کوردیمان لە هەفتاکاندا دەبینین :

١ – بە پێ‌ی قەوارە گەورەترین کتێبی کوردی شەرەفنامەیەو لاپەرەکانی (١١٠٦) لاپەرەیە لەم ماوەیەدا چاپکراوە ، جگە لە یانزدە کتێبی دیکەمان کە لاپەرەی هەر یەکێکیان لە نێوان (٥٠٢)و (٩١٣) لاپەرەیە .

٢ – لە هەفتاکاندا دەربارەی زیندوو کردنەوەی کەلەپووری کوردی دیوانی ئەم شاعیرانە چاپکراوەو لێکۆلینەوە لە سەر بەشێکیان کراوە (بێ‌کەس پیرەمێرد ، صەبری هەورامی ، بەرتۆیی؟ هەکاری ، حاجی قادری کۆیی ، خانای قبادی ، قانع ، مەلاّی جزیری ، نالی ، وەفایی ، خانی) . لەم شاعیرانە لە هەموویان پتر لە سەر (نالی) پێنج کتێب بە قەوارەی (١٨٧٣) لاپەرەیە دەرچووە .

٣ – لە مەیدانی فەرهەنگدا دە جۆرە فەرهەنگمان لەم ماوەیەدا دەرچووە .

٤ – بۆ یەکەم جار دووداستان کراونەتە کوردی (دایك)ی گۆرکی‌و (گێلەپیاوی)ی عزیز نەسینە .

٥ – لە هەفتاکاندا سێ نووسەری کوردمان لە وەرگێراندا دەستێکی بالاّیان هەبووە (یەکەمیان) عزیز گەردی‌یەکە یانزدە کتێبی بە قەوارەی (١٥٠٩) لاپەرە کردووتە کوردی (دووەمیان) جەلال تەقی‌یە کە جەوت کتێبی بە قەوارەی (١١٦٩) لاپەرە لە رووسی‌یەوە کردوتە کوردی (سێ‌یەمیان) شکور مستەفایە کە چوار کتێبی بە قەوارەی (١٠٠٨) لاپەرە کردۆتە کوردی .

٦ – لە سەری سەرەوەی هەموو نووسەری ئەم ماوەیەمان مامۆستا عبد الکریم مودەرسە ، کە لە هەفتاکاندا دە کتێبی کوردی بە قەوارەی (٤٢٠١) لاپەرە چاپکردو بلاّو کردۆتەوە .

بە هۆی ئەم بزووتنەوە رۆشنبیری‌یە گەورەیەی کە لە هەفتاکاندا هاتە گۆرێ دەبینین لە هەفتاکاندا (١٥٣) نووسەری نوێیان هاتنە سەر جیهانی نووسینەوەو لە ماوەی ئەم دە ساڵەشدا ئەم نووسەرانەمان کۆچی دوایی‌یان کرد (أ . ب . هەوری ، ئەسعەد مەحوی ، ئیسماعیل حەق شاوێس ، حاجی باقی – بەنگینە ، حسن فەهمی جاف ، رەفیق چالاك ، رەمزی قەزاز ، گیو موکریانی ، لەتیف حامد ، لەتیف شێخ محمودی حەفید ، عەلی باپیر اغا ، محمد توفیق ووردی ، مهند ئاغای فانی) . لە هەندەرانیشدا ئەم نووسەرانەمان سەریان نایەوە (ایە اللەی مەردۆخی ، تاهیر مەریوانی ، قەدری جان ، کامەران بەدرخان نوری دەرسیمی) .

بەراوردکردنێك :

بۆ ئەوەی لە سەرکەوتنو داکەوتنی بەرهەمی کوردیمان بگەین بە پێویستی ئەزانم ئەمجارە بە چاوێکی بەراوردکاری‌یەوە بروانینە بەرهەمی هەفتاکانمانو ساڵانی پێش هەفتاکان :

١ – بە پێ‌ی ژمارەو قەوارە :

| | ژمارەی کتێب | بە قەوارەی لاپەرە |
|---|---|---|
| لە بیستەکان | ٢٨ | ١٣٦٠ |

| | | |
|---|---|---|
| لە سی‌یەکان | ١٥١ | ١١١٦٢ |
| لە چلەکان | ٥٢ | ٤٠٥٤ |
| لە پەنجاکان | ٢٨٦ | ٢٨٤٢٩ |
| لە شەستەکان | ٣١٨ | ٣٥٧٩٣ |
| لە حەفتاکان | ٧٦٢ | ٨٦٩٠٧ |
| کۆی‌دەکاتە | ١٥٩٧ | ١٦٨ر٧١٥ |

ئەبێ ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە لە سەرەتای دەرچوونی یەکەم کتێبی کوردیمان لە عیراق‌دا تا دوا رۆژەکانی سالی ١٩٦٩ (٨٤٤) ژمارە کتێب بە قەوارەی (٨١٧٩٨) لاپەرە دەرچووە بەلام لە حەفتاکاندا (٧٦٢) ژمارە کتێبان بە قەوارەی (٨٦٩٠٧) لاپەرە دەرچووە ، واتە حەفتاکان لە کۆی پەنجا سالی پێش خۆیەوە (٤١٠٩) لاپەرە کتێبی بترە .

٢ – بە پێ‌ی بابەت :

| | سالانی پێش‌حەفتا | حەفتاکان |
|---|---|---|
| ئایین | ٢٩٪ | ٥ر١٠٪ |
| شیعر | ٢٧٪ | ١٩٪ |
| چیرۆك | ١٠٪ | ٨٪ |
| فەلسەفەو سیاسی | ٩٪ | ٥ر٩٪ |
| زمان | ٨٪ | ١٠٪ |
| لێکۆلنەوە | ٧٪ | ١٣٪ |
| مێژوو | ٧٪ | ٥٪ |
| فۆلکلۆر | ٣٪ | ٦٪ |
| شانۆگەری | ٢٪ | ٥ر٢٪ |
| منالّ | ٢٪ | ٢٪ |
| زانست | ٢١٪ | |

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کتێبی بابەتە شیعرو چیرۆك جلەوی گێراوەتەوە لێکۆلینەوەو بابەتی فۆلکلۆرو زمان لە برەودایە لە کاتێکدا کتێبی بابەتە شانۆگەری‌و منالّ‌و زانست لە شوێن خۆیدا مورا وەحە ئەکات .

٣ ـ لە مادەی پەنجا سالی نووسین‌و چاپکردنی کتێبی کوردی پێش پەنجاکان (١٤٣) نووسەرمان لە مەیدانی نووسین لە دایك بوون کە چی لە ماوەی دە سالی حەفتاکان (١٥٣) نووسەری نوێیان سەریان هەلّداوە .

لە سێ سالی هەشتاکانماندا واتە سالانی ١٩٨٠و ١٩٨١و ١٩٨٢ کاروانی کتێبی کوردی ملی رێ‌ی خۆی گرتوەو نەوەستاوە .

ئەبینین لە سالی هەشتادا (١٠٢) ژمارە کتێبمان بە قەوارەی (١٢٧٨٦) لاپەرە دەرچووە ، لە سالی ١٩٨١ یشدا (٧٣) ژمارە بە قەوارەی (٨٧٢٣) لاپەرە دەرچووە کە چی لە سالی (١٩٨٢) دابەزیوەتە سەر (٥٩) ژمارە کتێب بە قەوارەی (٥٥١٦) لاپەرە کتێب . هەرچەندە ئەم داکشانە پەیوەندی بە باری گشتی وولاتەوە هەیە . بەلام ئەبێت ئێمەی نووسەری کوردو دەزگا رۆشنبیرەکان‌و دلسۆزانی تر لە ناوخۆدا چارەیەکی ئەم دیاردەیە بکەن .

یارمەتی دانی دەزگا رۆشنبیری یەکانیشمان لەم سێ سالەدا بەم جۆرە بووە :

| | سالی ١٩٨٠ | سالی ١٩٨١ | سالی ١٩٨٢ |
|---|---|---|---|
| دەزگای رۆشنبیری | ٢٦ ژمارەبەقەوارەی ٢٢١٦ لاپەرە | ٣٦ژ/قە ٥١١١ لاپەرە | ٢٩ژ/٢٨٠٥ ل |
| ئەمینداریتی گشتی | ٩ژ/ق ٧٠١ل | ١٠ژ/ق ١١٠١ل | ١٩ژ/ق ٢٦٢٩ل |
| کۆری زانیاری | ٣ژ/ق ٩٠٤ل | ٤ژ/ق ٦٥٥ | ١ژ/ق ٨٢ل |

جگە لەوەی کۆمەلّەی رۆشنبیری کوردی لەم سێ سالەدا پێنج کتێبی بە قەوارەی (٤١٨) لاپەرەو یەکێتی نووسەرانی کوردیش دوو کتێبی بە قەوارەی (٦٤٠) لاپەرە چاپکردوە .

سەرجەمی بلاوکردنەوەی دەزگا رۆشنبیرەکان لەم سێ سالەدا دەکاتە (١٥٧) ژمارە کتێب بە قەوارەی (٧١٣١٠) لاپەرە ئەمیش بە پێ‌ی رێژەی صەدی دەکاتە نزیکەی لە ٥٠٪ی کتێبی کوردی ، ئەبێ ئەوەش بزانین لە رێزی پێشەوەی دەزگا رۆشنبیری‌یەکان لەم سێ سالەدا (دەزگای رۆشنبیری)یە کە لەم سێ سالەدا نزیکەی لە ٥٥٪ی دەزگاکانی تری گرتووتەوە .

ئێمەی خوێنەرو نووسەرو جەماوەری کورد با سەر بۆ ئەو نووسەرە بەرێزانە دابنوێنین کە لە رێزی هەرە پێشەوەی نووسەرانی کورد تێ‌دەکۆشن بۆ بەرهەم بترکردن وا ناوی هەندێك لەو کەلّە نووسەرانەتان پێشکەش ئەکەم :

١ – مامۆستا مەلا عبد الکریمی مودەرِّس – لە سالی (١٩٣٧) یەکەم کتێبی بە ناو (اقبال نامە) وە چاپکردووە ، لەو سالەوە چ دە سالێك تێ‌نەپەریوە کە بەرهەم پێشکەش ئەم میللەتە نەکات ، لە ماوەی ئەم چل‌و شەش سالەدا (٢٩) کتێبی کوردی بە قەوارەی (٦٥٦٣) لاپەرە کتێب چاپکردوەو بلاوکردوەتەوە .

٢ – مامۆستا عەلائەدین سجادی – لە ساڵی (١٩٥٢) مێژووی ئەدەبی کوردی چاپکردوە تا رشتەی مرداری جزمی هەستەمی (٢١) کتێبی بە قەوارەی (٥٢٦٦) لاپەرە چاپکردووە .
٣ – مامۆستا محمدی مەلا کەریم – لە ساڵی (١٩٥٨) ەوە تا ساڵی (١٩٨١) ١٥ کتێبی کوردی بە قەوارەی (٣٢٢٥) لاپەرە چاپکردووە .
٤ – مامۆستا شێخ محمدی خاڵ : لە ساڵی ١٩٣٤ (تەفسیری جزمی عمەی) چاپکردووە ، لەم ماوەیەدا (١٥) کتێبی بە قەوارەی (٣٠٥٧) لاپەرە کتێب چاپکردووە .
٥ – مامۆستای خواڵی خۆشبوو : (صادق بهاء الدین ئامێدی) لە ساڵانی (١٩٧٢ – ١٩٧٨) حەوت کتێبی بە قەوارەی (٣٠٠٤) لاپەرە چاپکردووە .
٦ – خواڵی خۆشبوو : (گیو موکریانی) لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠ – ١٩٧٥) شانزدە کتێبی خۆی بە قەوارەی (٢٩٢٢) لاپەرە چاپکردووە .
٧ – مامۆستا شاکر فتاح لەماوەی (١٩٣٣ – ١٩٨٣) چل کتێبی بە قەوارەی (٢١٣٣) لاپەرە چاپکردووە .
٨ – مامۆستا عەزیز گەردی لە نیوان (١٩٧٢ – ١٩٨٣) شانزدە کتێبی بە قەوارەی (٢١٤٤) لاپەرە چاپکردووە .
٩ – خواڵی خۆشبوو (حسین حزنی موکریانی) کە حەفدە کتێبی بە قەوارەی (١٦٨١) لاپەرە چاپکردووە .
١٠ – مامۆستا (شکور مستەفا) حەوت کتێبی بە قەوارەی (١٤٨٠) لاپەرە چاپکردووە .

سەرەنجای ئەم کورتە باسەمان :

دوای ئەمەی لەگەڵ کاروانی روشنبیری کوردیماندا گەیشتینە دوا قۆناغ بە پێویستی ئەزانم ئەم زانیاری‌یەتان بە پاڵکراوی بخەمە بەردەست :
١ – لە سەرەتای دەرچوونی یەکەم کتێبی کوردیمان لە عیراقدا تا دوا رۆژی ساڵی ١٩٨٢ (١٨٥٤) ژمارە کتێبان بە قەوارەی (١٩٩ر٥٩٢) لاپەرە کتێب چاپکراوە .
٢ – بە پێی دە ساڵ بژمێرین لە هەفتاکاندا لە هەموو دە ساڵەکانی تر زیاتر کتێبان چاپکراوە کە رێژەی سەدی دەکاتە نزیکەی لە ٦٠٪ی کتێبەکانمان .
٣ – دەزگا رۆشنبیریەکانمان بوونە هۆی چاپکردن بلاوکردنە وەی نزیکەی لە ٥٠٪ی کتێبی کوردیمان .
٤ – ساڵی ١٩٧٨ بە ساڵی زێرینی کتێبی کوردی دائەنرێت



چونکە لەو ساڵەدا (١٢٧) ژمارە کتێبان بە قەوارەی (١٣٣١١) لاپەرە چاپکراوە پاش ئەوە ساڵی (١٩٧٩)یە کە (١١٨) ژمارە کتێبان بە قەوارەی (١٣١١٩) لاپەرە چاپکراوە .
٥ – بە پێی بابەت هێشتا شیعر لە پێشەوەیە کە رێژەی سەدی دەکاتە نزیکەی لە ١٨٪ ئینجا جیروك لە ١٢٪ پاش ئەوە کتێبی ئاینی‌یە کە لە ٦١٠ ئەگرێتەوە . ئەوەی مایەی دڵ خۆشی‌یە لەم دوایی‌یەدا بایەخ دراوەتە لێکولینەوەو زیندوو کردنەوەی کە لە پووری کوردو وەرگێران لە زمانی ترەوە بۆ کوردی .

بە گشتی نووسەرانی کورد تا رادەیەکی باش ئەرکی سەر شانی خۆیان بەرامبەر بە گەڵ و وولات هێناوەتە جێ بۆ ئەوەی بەرهەمی کوردی بەرەوپێشەوە هەنگاو بنێت پێویستمان بە هاوکاریەکی بتەو هەیە لە نیوان نووسەران و خوێنەواران و دەزگا روشنبیری‌یەکان و خاوەن کتێبخانەکانمان . لەم هەڵ و مەرجەدا ئەرکی چاپ‌کردنی کتێب دە چەندانی ساڵانی پەنجاو شەستەکانە خۆینەوەر ئەبی بەم چاوەو بروانێتە کرین و هاندانی کتێبی کوردی هەروەها لە سەر کتێبخانەکانمانە بە چاوێکی بارزگانی‌یەوە نەروانە بەرهەمی کوردی .

# خوێندنی کوردی
# لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا



د . احسان فؤاد

لە چوارچێوەی ئاهەنگ گێران بە بۆنەی جەژنەکانی تەمووزی ئەمردا لە · میهرەجانی رۆشنبیری دەزگانی رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی لە هەولێردا لە بەیانیی رۆژی ٢٨ ی تەمووزی ١٩٨٣دا کۆڕێکی تایبەتی بۆ (بەڕێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی کوردی) ڕێکخرا ، ئەم کورە لە لایەن د . نافع عقراوییەوە بەڕێوە دەبراو بەڕێوەبەری گشتی د . احسان فؤاد دەربارەی پەرەسەندنی خوێندنی کوردی لە ناوچەی ئۆتۆنومیدا بە تایبەتی لە سایەی شۆڕش ١٧ - ٣٠ی تەمووز لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەش کرد .وا لە خوارەوە دەقی لێکۆڵینەوەکە بلاودەکەینەوە .

مامۆستایانی بەڕێز ،
خوشك و برایانی هێژا ،

وەکو هەموو دەزانن یەکێك لەو دەزگایانەی سەرپەرشتی بلاوکردنەوەو خوێندنی زمانی کوردی دەکات لە ناوچەی ئوتۆنۆمیدا زانستیو پەروەردە لە هەموو قوتابخانەکاندا بلاودەکاتەوە بەرێوەرێتیی گشتیی خوێندنی کوردییە ، کە یەکێکە لە بەڕێوەبەرایەتییەکانی وەزارەتی پەروەردە . دیارەئەرکی ئەم بەرێوەبەرێتییە بلاوکردنەوەی زانستو پەروەردەیە بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی کوردستاندا . لەبەر ئەوەی هەتاوەکو ئێستا گەلێ گۆڕینو گواستنەوەی بە سەردا هاتووەکەبووەتە هۆی ئەوەی ئەرکەکانی بە تەواوی نەزانرێت لە لایەن زوربەی خوێندەوارانو رۆشنبیرانەوە وامان بە پێویست زانی ئەگەر بە شێوەیەکی کورتیش بێت چەند قسەیەك بکەین دەربارەی مێژووی دامەزراندنیو ئەرکەکانی دوێنێو ئەمرۆی ، بە تایبەتی ئەمە پێویستە ئەگەر بزانین کە ئەرکی دانانو وەرگێڕانو بلاوکردنەوەی هەموو بابەتەکانی وەزارەتی پەروەردە لە هەر سێ پلەکانی خوێندندا لە قۆناغەکانی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەییدا . ئایا ئەمە کتێبی زانستی بێت وەکو فیزیاو کیمیاو بیرکاریو تەندروستی یان بابەتی زانستی کۆمەلایەتی (اجتماعات) وەکو مێژوو ، جوغرافیەو پەروەردەی نیشتمانی کارێکی سەرەکی ئەم بەرێوەبەرێتییەیە .

ئەمە جگە لەوەی دارشتنو داهێنانی سەدەها زاراوەی نوێ ، هەولدان بۆ یەکگرتنی شێوازی رێنووسی کوردی ، دەرکردنی دەیان فلیمی پەروەردەیی بۆ قوتابیان ، کۆکردنەوەی هەندێ سەرژمێریی دەربارەی قوتابخانەکان لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا ، چاپکردنی چەند نامێلکەیەك بۆ مندالان ، لەگەلێ یارمەتیدانی بە دەیان نووسەر بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانیان ، وەدەرکردنی گۆڤارێکی تایبەتیی پەروەردەیی . هەموو ئەمانە کەمو زۆر لە چالاکیانەن کە ئەم بەرێوەبەرێتییە گشتییە هەولیداوە بۆ جێبەجێکردنی .

(١) مێژوویەکی کورتی
دامەزراندنی بەرێوەبەرێتی‌ی
گشتی خوێندنی کوردی :

یەکەم هەنگاو ئەوە بوو کە لە ١٩٥٩دا دەزگایەك دامەزرا بە ناوی بەرێوەبەرێتی‌ی زانیاریی گشتی‌ی کوردی‌یەوە (المديرية العامة للمعارف الكردية) لە وەزارەتی مەعاریفی ئەوسادا لەم سەرەتایەیدا بەرێوەبەرێتی‌یەکە کادیری کەم‌بوو جگە لەوەش مەودای خوێندنی کوردیش تەنیا لە قوتابخانە سەرەتایی‌یەکاندابوو لە هەموو ناوچە کوردی‌یەکانیشدا نەبوو ، لەبەرئەوە ژمارەی ئەم کتێبانە وەکو کتێبی (خوێندنەوەی کوردی) ، (حیساب‌وپێوان) ، (صحة—پەروەردەی‌تەندروستی)ولەم بابەتانە بوو .

لە ساڵی ١٩٦٧دا بە پێ‌ی یاسای ژمارە (١٧) ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە ناوی گۆڕا بە بەرێوەبەرێتی گشتی‌ی پەردەردەی کوردی (مديرية التربية العامة للدراسة الكردية) وەلە بنیادی وەزارەتی پەروەردەی ئەوسادا جێگیربوو . دیسانەوە لەم سەردەمەدا مەودای خوێندنی کوردی سنووردار بوو .

گەورەترین پەرەسەندنی ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە دوای بەیاننامەی مارتی ١٩٧٠ بوو ، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٧٢دا بە پێ‌ی یاسای ژمارە(٢٢)ی ئەو وەختە قەوارەیەکی گەشەدارو تایبەتی بۆ بەرێوەبەرێتی‌یەکە دامەزرا بە پێ‌ی ئەم یاسایە بەرێوەبەرێتی‌ی گشتی خوێندنی کوردی لە هەشت بەشی سەرەکی پەیدابووبوو کە ئەمانەن :

١ — بەرێوەبەرێتی‌ی پەروەروە
٢ — بەرێوەبەرێتی‌ی بەرنامەو کتێب
٣ — بەربۆەبەرێتی تەجهیزات .
٤ — بەرێوەبەرێتی‌ی سەرپەرشتی پەروەردەیی
٥ — بەرێوەبەرێتی سەرژمێری (احصاء) .
٦ — بەرێوەبەرێتی ژمێرياری‌و ...تاد . لەم سەردەمەدا ئەرکی سەرپەرشتی‌کردنی هەموو ئەو قوتابخانانەی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا دامەزرابوو لە رووی بەرنامەو سەرپەرشتی‌ی پەروەردی‌یەوە سەر بەم بەرێوەبەرێتی‌یە بوو .

دەبێ ئەوەش بڵێین کە بەر لە شۆڕش ١٧ی تەمووزو لە پاش شۆڕشیشدا تا بڵاوکردنەوەی یاسای دامەزراندنی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی ،ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە سەر بە وەزارەتی کاروباری ژووروی ئەوسابوو کە لە ئەنجامیدا وەپێ‌ی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆڕش ئەمانەتی گشتی‌ی پەروەردەو خوێندنی باڵا دامەزرا بە پێ‌ی ئەم بڕیارە لایەنی بەرێوەبردنو سەرپەرشتی کردنی قوتابخانەکانی کوردستان درا بەم ئەمانەتە گشتی‌یە ،بەرێوەبەرێتی گشتی‌ی خوێندنی کوردیش گەڕایەوە وەزارەتی پەروەروە ، وەتەنیا ئەو ئەرکانەی پی‌ٚسپێردرا کە پەیوەندی بەلایەنی هونەری‌و وەرگێڕانو چاپ‌کردنی کتێبەکانەوە هەیە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بەردی بناغەی هەموو خوێندنی کوردی‌یە .

(٢) ئەرکەکانی ئێستای .
بەرێوەبەرێتی‌ی گشتی‌ی خوێندنی‌کوردی :

هەموو ئەو کتێبانەی لە قۆناغی سەرەتاییدا جگە لە زمانی عەرەبی‌و ئینگلیزی لە لایەن ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە چاپ‌دەکری‌و بڵاودەکریتەوە ، وەکو بابەتەکانی پەروەردەیی‌و ،بیرکاری ،خوێندنەوە ، زانستی پەروەردەیی ، بنچینەکانی پەروەردەی کشتوکاڵ وەلە پۆلە پێشکەوتووەکاندا کتێبی ڕێزمانی کوردی بۆ قوتابیان داندراوە . دەبێ ئەوەش بگوترێ کە تێکڕا ئەم کتێبانە بە وەرگێڕاوی لە زمانی عەرەبی‌یەوە بۆ کوردی دەخرێتە بە دەم قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی جگە لە ئەلف‌بای پۆلی یەکەمی سەرەتایی‌و خوێندنەوەی پۆلی سی‌و ڕێزمانی پۆلی پێنجەم‌و شەشەمی سەرەتایی .

لە قۆناغی ناوەندی‌و ئامادەییشدا وەرگێڕانی هەموو کتێبە زانستی‌یەکان وەکو بابەتی سی‌گۆشەکان ، بیرکاری ، کیمیا ، فیزیا ، ئابووری ... تاد .. لەگەڵ بابەتەکانی مێژوو ،جوغرافیە ،پەروورده ،ب ،بەدکرمی میللی ..لە لایەن ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە جێ‌بەجێدەکرێ .لەم دوو قۆناغەدا دانانی کتێبی زمانو ئەدەبی کوردی یەکێکە لە ئەرکە گرنگەکانی ئەم بەرێوەبەرێتی‌یە . ئەگەر بەراووردێك بکەین لە نێوان ژمارەی ئەم کتێبانەدا کە لە ساڵی ١٩٧٢ بەولاوە چاپکراون نزیکەی ٨٦ کتێبە ،کە چی لە ساڵانی ٥٠ —١٩٥٩دا ژمارەی کتێبەکان لە ١٠ کتێب کەمترە .

(٣) ئەرك‌و .
پێویستی‌ی دیکە

وەکو لەمەوبەرگوترا گەلێك لە زاراوە زانستی‌یەکان لە لایەن ئەم بەرێوەبەرێتی‌یەوە بۆ یەکەم جار چەسپێنراوە کە ئەمە تەووژم‌و تینێکی داوە بە پەرەسەندنو پێش‌خستنی زمانی کوردی .لەوانەیە لای زۆر کەس ئەم کارە ئەوەندە جێ‌ی بایەخ نەبێ بەڵام وەکو راستی‌یەك دەبێ بڵێین لە وولاتە پێشکەوتووەکانی جیهاندا بایەخێکی زۆر دەدرێ بە دانانر زاراوە ، راستە لەو وولاتانەدا

ئەکادیمیە زانستی‌یەکان ئەم کارە دەکەن ، وەتەنیا دوای لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ ئنجا ئەم زاراوانە دەخرێنە بەردەست ئینجا ئەگەر ئێمە بزانین کە ژمارەی ئەم زاراوانە لە ماوە ، ئەم دە ساڵەدا لە هەزار زاراوەی نوێ زیاترە ئەو وەختە دەزانین رەنجی مامۆستایانو پسپۆرانی زمانی کوردی چەند پیرۆزو مەزنە بۆ پێشکەوتنی زمانو ئەدەبیاتی کوردی .

بێگومان ناتوانین بڵێین کە ئەم زاراوانە گشتیان راستو دروستن چونکە هەندێ جار (خێرایی) کراوە لەم ئەرکەدا وەهەندێ زاراوە هەیە بەراوورد نەکراوە لەگەڵ لاتینیو عەرەبیدا بە شێوەیەکی وورد . بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەم جۆرە ئەرکە مەزنە هەموو توانا شاردراوەکانی زمانەکانی جووڵاندووە . بێگومان دەبێ ئەوەش بڵێین کە دانانی چەند لێژنەیەکی هاوکاری لەگەڵ هەموو ئەو دەزگایانەدا کە بەراستی ئەیانەوێ زمانی کوردی پێش بخەن وەکو . کۆری زانیاری کوردی ، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لەوەزارەتی راگەماندن وەلەگەڵ بەشە کوردی‌یەکانی زانستگاکاندا دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم زاراوانە بژاربکرێنو لە سەر بنچینەیەکی زانستی پێشکەش بە قوتابیانی خۆشەویست بکرێت ، بۆ ئەمەش بە تایبەتی دەتوانرێ سوود لەو پسپۆرانە وەربگیرێت کە شارەزای زمانو لە دەرەوەی وولات گەڕاوانەتەوە .

دانیشتوانی بەرێز :

وەك ئاگاداریی‌یەك لە ژمارەی ئەو کتێبانەی لە لایەن ئەم بەرێوەبەرێتی‌یەوە لە سەردەمی جیاواز جیاوازدا چاپکراوە حەزئەکەم رێم بدەن بەشێکی کەمی بخەمە بەردەمتان لەساڵی ١٩٦٩-١٩٧٠دا بەرێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی کوردی تێکرا (٢٨) کتێبی چاپکردووە کە ژمارەیان ٢٤٥٠٠٠ دانەیە . لەکاتێکدا لە ساڵی ٧٤-١٩٧٥دا پاش ئەو هەنگاوە گەورەی سەرکردایەتیی شۆڕش نای بۆ هاندانو فراوانکردنی خوێندنی کوردی . لە پاش ئەوەی بە بەرنامەیەکی (بەرەبەرەیی) هەموو کتێبەکانی ناوەندیو ئامادەیی کران بە کوردی تێکرا ژمارەی ئەم کتێبانە بوو بە (٨٠) بە ٨٣٨،٠٠٠ دانە . لە ساڵی ٧٨-١٩٧٩دا لە لایەن بەرێوەبەرێتی‌یەکەمانەوە ١،٢٥٣،٠٠٠ دانە کتێبی قوتابخانەکان چاپکراوە ئەم ژمارانەی سەرەوە بەراوردێکی بچکۆلانەبوو بۆ پێشاندانی رادەی پەرەسەندنی خوێندنی کوردی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا

جگە لەمانەش بەرێوەبەرێتیی گشتی خوێندنی کوردی



دەستی یارمەتی درێژ کردووە بۆ ئەو نووسەرانەی بەرهەمی ئەدەبیو زانستییان بڵاوکردۆتەوە لەو ساڵانەشدا کە هەر خۆی تاکە دەزگایەك‌بوو ئەم کارەی دەکرد . شتێکی خراپ نەبوو . سەرجەمی ئەو کتێبانەش (٧٩) کتێبی جیاوازە . بەشی زۆریان لێکۆڵینەوە . چیرۆکی شانۆ . دەستنووسی کۆن . فۆلکلۆر . گیروگرفتی پەروەردەییو دیوانی شاعیرانی کۆنو نوێی کوردە .

هەتا ئێستاش (١٤) ژمارە نامیلکەی هۆی روونکردنەوەی بۆ منداڵان دەرکردووە . کە ئەمانە بەشێکن لە پرۆژەی زنجیرەی چیرۆکی منداڵان ، لە بەرگێکی رەنگاورەنگداو بە وێنەوە لە چاپی داوە .

لە ساڵی ١٩٧٠دا چەند (دەورە)یەکی دەرس‌ووتنەوەی رێك‌خست بۆ مامۆستایان کە بە پێی بەرنامەیەکی تایبەتی لێکۆڵینەوە کراوە دەربارەی گیروگرفتەکانی زمانی کوردی وباشترین رێگا بۆ دەرس‌گوتنەوەی ، ئەمەش بۆ راهێنانو بەهێزکردنی توانای مامۆستایانی دەرسی کوردی .

لە ساڵی ١٩٧٣دا لە تەمووزدا کۆرێکی تایبەتی لە شەقلاوە ئامادەکرا بۆ کێشەکانی کتێبی قوتابخانەکان بە زمانی کوردی ، لەم کۆرەدا (١٢٠) مامۆستا کە بەشێکیان شارەزاو پسپۆربوون ، نۆ لێکۆڵینەوەی زانستییان خوێندەوە لە ئەنجامی ئەم کۆرە گرنگەدا هەندێ بریارو راسپێریی گرنگ جێگیرکرا .

یەکێك لەو کارە گرنگانەی لە لایەن ئەم بەرێوەبەرێتی‌یەوە

جێبەجێ‌کرا گەلاڵەی فەرهەنگێکە بۆ زاراوەکان کە مامۆستایانی بەرێز ئەبێ بەرچاویان کەوتبێ ، لە ژمارە (١٤)ی گۆڤاری (پەروەردەوزانست)دا بە (١١٦) لاپەڕەو نزیکەی ٤٢٠٠ زاراوەی تێدا کۆکراوەتەوە وەکو لەمەوبەر گوتم مەرج‌نییە ئەم هەموو زاراوانە لە لایەن بەڕێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی کوردییەوە جێبەجێ‌بکرێ ، بەڵام ئەو مەودای مەشق‌کردنە کە لە کۆڕی قوتابخانەکاندا لە ئەنجامی دەرس وتنەوەدا دروست‌بووە باشترین سەنگی محەکە بۆ راست‌و دروستیی ئەم زاراوانە ، ئەبێ دان بەوەشدا بنێم کە وەرگێڕان‌و دانانی زاراوە کارێکی ئاسان نییە لەمەشدا سوپاسێکی بێ‌پایانی هەموو ئەو مامۆستا دڵسۆزانە دەکەم کە رەنجێکی دڵسۆزو ئارەقێکی زۆریان رشتوە لە پێناوی هێنانەدی ئەم ئامانجە پیرۆزەدا .

بە پێی بڕیارێکی تایبەتی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش بڕیاردرا کە هەموو بابەتەکانی کۆمەڵایەتی لە مێژوو ، جوغرافیاو پەروەردە بکرێتەوە بە کوردی ، بۆ ئەم مەبەستە بەڕێوەبەرێتیی گشتی (٢٢) لیژنەی جیاوازی دانا ئەمساڵ ، وە ئێستا ئەم لیژنانە خەریکی کارەکانیانن بۆ ئەوەی ئێمەش بە زووترین کات ئەرکی پێداچوونەوەو چاپ کردنیان بگرینە ئەستۆ . بەپێی رای هەندێ مامۆستا وا بە باشتر زانراوە کە وەرگێڕانی ئەرکی کتێبێك بدرێ بە یەك تاقە کەسی شارەزا ، ئێمە لەگەڵ رێزماندا بۆ ئەم رایە ئەبێ ئەوە بخەینە بەرچاو کە کارێکی وا وورد نادرێتە دەست تاقە کەسێك مەگەر بە ناچاری نەبێت ، چونکە ئەبێ ئەرکی ئەو مامۆستایەی ئەو بابەتە دەڵێتەوە لەگەڵ ئەرکی ئەدیبێکی کوردی زاندا یەك بگرێتەوە ، ئەمە جگە لە رەچاو کردنی لایەنی سایکۆلۆجیی‌و پەروەردەیی کە دەگۆڕێت بە پێ پلەی پێگەیشتنی قوتابیان ، پێویستە دیسان بە چاوی بایەخەوە سەیری بکرێت .

مامۆستایانی بەرێز ،

ئەمە کورتەیەکی پێناسین‌بوو بە چالاکی‌و کاروباری بەڕێوەبەرێتی‌یەکەمان ، حەزیش دەکەم کە سوود لەم دەرفەتە وەربگرین وەچ پرسیارێکی تایبەتی وەگشتی هەبێت لەپێناوی پێش‌خستنی خوێندنی کوردیدا بە سوپاسەوە ئامادەین وەرامی بدەینەوە .

بەم بۆنەیەشەوە ئەبێ زۆر سوپاسی بەڕێوەبەرانی ئەم میهرەجانە لە دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی بکەم ، بەتایبەتی جەنابی بەڕێوەبەری گشتی کاك مصلح جەلالی ، کە هەوڵ‌و رەنجێکی زۆریان دا بۆ رێکخستنی ئەم کۆڕە .



لە پاش تەواوبوونی خوێندنەوەی لێکۆلینەوەکە کۆمەڵێك پرسیارو پێشنیاری بە جێ‌کرا لە لایەن مامۆستایان‌و قوتابییانەوە دەربارەی چۆنیەتی دانانی کتێبەکانی خوێندن ، رادەی بڵاوبوونەوەی خوێندنی کوردی لە پارێزگای دهۆکدا ، بایەخ‌دان بە مێژوو و کەلەپووری ناوچەکەو خستنیانە ناو کتێبەکانەوە ، گلەیی لە نەگەیشتنی ژمارەی گۆڤاری (پەروەردەو زانست)و نامیلکەکان کە هەروەکو باس کرا لە هۆڵەکانی کۆگای پەروەردەی هەولێردا بێ‌ناز کەوتوون ، وە نە لە نامەخانەکاندا دەست‌دەکەوێ‌و نە بە سەر مامۆستاو قوتابییاندا دابەش دەکرێ .

لە وەرامدا بەڕێوەبەری گشتیی خوێندنی کوردی گوتی ئەم زانیارییانە لە دەمێکەوە لای ئێمە هەیەو هەوڵی تایبەتیشمان داوە بە نامەنووسین تایبەتی ، بە تایبەتی لە بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی هەولێر ، جارێکی کەش دووبارەی دەکەینەوە کە ئێمە ئەم هەوڵە بۆ خزمەتی خوێندنی کوردی دەدەین ، سەرکردایەتی شۆڕشیش ئاوردانەوەیەکی مەردانەی لەم لایەنە داوەتەوە ، ئەمێنێتەوە ئەوەی کە خۆمان بەرپرسیارین بەرامبەر مێژوو ، بەرامبەر نەتەوەکەمان بە یارمەتی کارەبەدەستانی دڵسۆز ، چاکی مەردانەی لێ‌بکەین بە لادا وە لە عیراق سەربەرز و قارەمانی شۆڕش ١٧ — ٣٠ی تەموزدا و لە ژێر سایەی سەرکردایەتیی دلێری صدام حسین‌دا ئەم ئاواتانە بە جێ‌دەگەیەنین .

# لێكۆڵینەوەی مێژوویی لە ڕۆژنامەگەری كوردی‌دا



د . جمال رشید احمد

**كە ئاوڕ لە لایەنی لێكۆڵینەوەی مێژوویی لە ڕۆژنامەگەری كوردی‌دا دەدەینەوە . ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كەوا هێژ ڕێبازەكەی لە چوارچێوەی گشتی بیری كلاسیكی ئازاد نەبووە . ئەو بیرەی . كە لایەنێكی زۆری گرتۆتەوەو لەگەڵ سەرهەڵدانی سەردەمی مەسیحی یەت‌دا لە وولاتانی ڕۆژهەڵات‌دا بڵاو بۆتەوە .**

لە دوای تێكچوونی ڕژێمی كۆیلایەتی لە دەولەتی بیزەنتیداو پەیدابوونی دەرەبەگایەتی ، كە ئەمەشیان لە ئەنجامی فراوان بوونێكی زۆری زەوی‌و زاری دەولەتی بیزەنتی‌و چەسپانی ڕژێمی سوپاسی لەگەڵ سەرهەڵدانی مەسیحی‌یەت‌دا پەیدا بوو ، كەنیسە بەرگرێكی زۆری لە سەرۆك هێزانی دەرەبەگانی دەكرد و بەتایبەتی لە سەردەمی ئیمبراتۆر باسیلی یەكەم لە (٧٦٧–٨٨٦)ی زایینی‌دا . ئەم پشتگیری كردن‌و بەرگری لی‌كردنە بەرادەیەك چەسپی بوو بە ڕژێمێكی كۆمەڵایەتی‌و ئابوری لە یاسای بێزەنتی‌داو لە ئەنجام‌دا ئیمپراتۆر نیكوفور فوكاس (٩٦٣–٩٦٩) ناچار بوو ، كە هەموو یاسایەكی دژی ئەم چینە داندرابوو ڕەشی بكاتەوە . هەتا ئەم سەردەمەش هەموو دەرگەیەك بەرامبەر بە مەسیحی‌یەت لە پێناوی ئاینەكەی خۆیاندا بۆ چینەكانی باڵاو ئەو خێزانانەی بەسەریان‌دا زاڵن كراوەتەوە . ئەمەش بۆ بە یەك گەیشتنی بەرژەوەندی هەردوولایان دەگەڕێتەوە ، بەڵام پەیدابوونی میرایەتی كوردی ئیسلامی لە ئەران‌و ئانی‌و گەنجەو میافارقین‌دا بوونە هۆی كزبوونی كەنیسە لە بڵاوكردنەوەی ئاینی خۆی‌داو هەروا بێ‌هێز بوونی هێرشەكانی ئیمبراتۆر نیكوفور بۆ سەر شەدادیان گەنجەی كورد بەرهەمێكی ئەوتۆیان پێ‌نەبرا ، بەڵام یاسای ئابوری كە سنووری بۆ مێژوو نووسین دانا هەر وەكو خۆی مایەوە . بۆیە ڕێبازی مەسیحی بۆ نووسینی مێژوو هەر بەهەمان جۆر بەردەوام بوو ، ئەم ڕێبازەش هەوڵدانێك بوو بۆ تۆماركردنی دەنگ‌و باسی میرو فەرمان ڕەوایانی دەست ڕۆیشتوو لە ئیمپراتۆریەتە كۆنەكان‌دا ، جیاوازیان بۆ ڕۆڵی ئەوانە لە ڕووی ئایین‌و ئاینزا (مذهب) و ڕادەی ڕێك‌كەوتنیان لە بواری مادی‌و پاشان لە بواری گیانی‌دا دادەنا . ووتەكان ونووسراوەكانی خۆیان بە ناورەڕۆكی كتێبی پیرۆز (العهد القدیم والجدید) موتوربە دەكرد ، كە لە چیرۆكی پەیدابوونی ئادەمیزادەوە تا هێرشە بێ‌دادەكانیان بۆ سەر هۆزە كۆچەرێكانی نا مەسیحی دەگرتەوە . ئێمە دەتوانین ئەم ڕاستیەمان بەرچاو بكەوی‌و هەستی پێ‌بكەن لە هەڵوێستیان‌دا بەرامبەر ئەو هۆزە كوردی‌یانەی ، كە باوەڕیان بە ئاینی مەسیحی هێناوەو هەزارانیان لە كەركووك شەهید كراون لەبەر ئەوەی دەستیان لە زەردەشتی هەڵگرتووە .

لە سەدەی سێ‌یەم‌و چوارەمی زایینی‌دا ، هەروا لە

نێوانیاندا چەندین قەشەی بە ناوبانگیان تێدا هەڵکەوت بەتایبەتی لە ( شەهرقرت ( پردێ ئالتونکۆپری )و (هربات گەلال) ، دەرئاباد لە باکووری کەرکوکو ( لاشوم (داقوق ئەمڕۆ) هەروا (دارا) لەسەر زێی بچووکو (کانیگار) و (بۆزان) و ناوچەکانی هەولێر کە (١٩) مەلبەندی قەشایەتیان لە رەواندوز ، بیث ماهکرت ، نوهدرا ، معلثا (لە نێزیك دهۆك) ، داسن ، مەرگە لە ناوچەکانی ئاکرێو زێبارو هیدی هەبوو بە پێچەوانەی ئەم هۆزانە ناوبانگی کورتاوییانو هیدییان بە بەدیو خراپی بردووە لەبەر ئەوەی باوەریان بە مەسیحیەت نەهێناوە .

ئەم رێبازە لە لایەن مێژوونووسانی موسوڵمانیش پێرەوی کراوە وەکو لاسایی کردنەوەیەك و لەسەر خواستی پەیدابوونی رەگەزی ئایینی بە شێوەیەکی فراوان وەکو بناخەیەك بۆ بنیاتێکی کۆمەلایەتی ، کە بە عەرەبی (الأمة)ی پێ دەڵێن .

جا بۆیە جێگەی سەرسورمان نییە گەر مێژووی میرو فەرمان روایانی کورد هەر بەم رێبازە نوسرابنەوە لە سەردەمی مەسیحیو موسڵماندداو لە لایەن (ابن الصبری تۆماسی مەرگەو سەبری یەشوعو مەسیحا زخاو هەروا ئەو بابەتە تۆمارکراوانەی کەرخاو بیث سلوخ ، و نووسراوەکانی (ابن الاثیرو ابن خلکانو تەبەریو فارقی ، ولە دوای ئەواندا .

بە ماوەیەکی درەنگتر هەمان رێباز لەلایەن حاجی خەلیفە و مونەجیم باشیو شەرەف خانی بدلیسیو هیدی پێرەو کراوە لەوانیە ئەمە هۆیەکی بێت لەو هۆیانەی ، کە وای لە مێژووی کورد کردبێ ، کەوا رووداوەکانی پچڕ پچڕ بێتو بە زنجیرەیەکی رێكو پێك نەنوسرێت ، بەرادەیەك بۆ وێنە هێندێك لە مێژوونووسان هەوڵیانداوە جیاوازی لە نێوان مێژووی یەزیدیان و مێژووی گەلی کورددا دانێن وەیا عەلیوللاهی لە کۆمەلانی دیدا دابچڕێنن . لە کۆنیشدا هەر بۆ وێنە تۆماسی مەرگە وەیا ابن العبری کرتاوێی لە کورد جیاکردۆتەوە وەیا هەر وەکو مەسعودی جورقانو یەعقوبی مەسیحی کورد لە کوردانی موسڵمانی جیا کردۆتەوە .

ئەم رێبازە کۆنەی مێژوو نووسین لە لایەن مێژوو نووسانی کورد لەکاتی تۆمارکردنی مێژووی خۆیاندا رەنگی داوەتەوەو پێرەوکراوە . لە یەکەمین رۆژنامەی کوردیدا (کردستان) ، کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا دەرچووە ئەم دیاردەیە ئاشکرا تێدا دیارە بە تایبەتی ، کە خاوەنەکەی مامۆستا مەدحەت بەدرخان دەربارەی مێژووی خانەوادەی نووسیویەتی ( گلی علماو میرو آغایین کرد أون حمی أصلو نسل من دظانن جد من حضرت خالد ابن ولیده (رضی الله تعالی عنه)/کردستان ژمارە ١ ، لاپەرە ٣- ، ١٣١٤ کۆچی هەروا لە هەمان ژمارەدا سەرنووسەر بەم جۆرە تکای خۆی ئاراستەی خوێندەوارانی گۆڤارەکەی دەکا وەکو بڵێ گۆڤارەکەی تەنیا بۆ میرانو ئاغایانی کورد تەرخان کراوە ، نەك بۆ هەموو گەلی کورد بۆیە دەڵێ :

( . . .از میرو آغایین کردا هیڤی دکم درحقا ڤنجیا کرداره چەبیت بلا ژمزه بنڤیسن / ژمارە یەك ، لاپەرە ٤-) .

دەربارەی نووسینی مێژووی کوردیش ،کە لە ژمارە ٨-ی بڵاوی کردۆتەوە هەر ناوی فەرمان رەوایانو میرانی کورد دەبا و دەربارەی (حکامین جزیرة ابن عمر) هەر تەنیا باسی میر سلیمان بن خالده میر عبدالعزیز ، امیر سیف‌الدین ، امیر مجدالدین ، امیر عیسی ، امیر بدرالدین ، امیر ابدال ، امیر عزالدین دەکاو لە ژمارەکانی دوای ئەوەشدا هەر باسی میرانی کورد دەکا) . هەروەکو بڵێی مێژووی گەلی کورد تەنیا مێژووی چینی فەرمان رەوایان و میرو دەرەبەگانە) .

مانەوەی زۆربەی نووسەران لەسەر پێرەوی کردنی ئەم رێبازە بە جۆرێك بەندی بوونە ، لە ئەنجامدا نەیتوانیوە کۆمەڵ بگەیەنەتە ئەو ئامانجەی ، کە ئەو مەبەستێی لە پێشان دانی ئەنجامی راستو دروست لە پێناوی روونکردنەوەی پێناسەی کەلجەری خۆی ، ئەمانە بوونەتە هۆیەك لەو هۆیانەی ، کە رێرەوی راستو رەوان بگرین لەکاتی لێکۆڵینەوەماندا لە مێژووی کورددا ، دەبا لێپرسراوانی رۆژنامەگەران تیشکێك بخەنە سەر باری زانستی ئەم بابەتەو بۆ ئەوەی زیاتر لە قوناخەکانی کۆنو نێوەڕاستی ئەم مێژووە نێزیك ببنەوە .

بێگومان لەم جۆرە هەڵوێستانەدا رێچکەی جیاواز جیاواز لێك دەدەنو هێندێك جار لێك نێزیك دەبنەوەو هێندێك جاریش دوور دەکەونەوە ، ئەلبەت ئەم جۆرە هەڵوێستانە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی هەڵوێستمان بەرامبەر بوونو ژیان بە شێوەیەکی گشتی ، ئەم جۆرە ئاڵۆ گۆرکردنەی رێچکەکان هێز لە پلەکانی یەکەمیان دانو بۆیە چاوەرێی بیرێکی رووناكو کارێکی چاو نەترسانەن ، بۆ ئەوەی بەرێکی بەپیت بێنێتە بەرهەمو هەر رێچکەیەکیش لەم رێچکانە تایبەتێی رەسەنی خۆی هەیە ، کە سەرچاوەی هەڵوێستی مێژوویی لێ هەل دەقوڵێ .

بۆ وێنە ئەو رێچکە کلاسیکی‌یەی لەمەوبەر باسمان کرد ، لە سەرچاوەکانی سەدەکانی نێوەراست‌دا بەرچاو دەکەوێ‌و ئەم بوونەشی بەم جۆرە راستە ، و دوور کەوتنەوەی لێی ، ناراستە ، لەگەڵ ئەوانەش‌دا ئەم رێچکەیە ئەم تایبەتێتی‌یانەی خوارەوەی هەیە :-

یەکەم – هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد مێژوو مێژووی نەتەوەیە لە تێروانینی ئایینەوە ، بۆیە بایەخیان هەر بەم لایەنەی داوە و ئەگەر ئاورێکیان لە هی‌دی‌یەوە دابێ ئەوە هەر لە رووی رووداوەکانی رابردوو و ئێستەوە تەماشایان کردووە .

دووەم – هۆی رووداوو پەرەسەندنی رووداوان بەپێی ئەم تێروانینە هۆیەکی خوایی‌یە . بۆیە دەڵێن رووداوای مێژوو بە دەستی ئادەمزاد نیە بەڵکو بەپێی خواستی خواو یاساکانی ئاسمانی‌یە .

سێ‌یەم – لە رووی شێوازی زانیاری مێژوویی‌یەوە دان نانو باوەرکردنە بە دەنگ‌و باسانی رابردوو .

بەڵام لە پاڵ ئەم رێچکەیەدا هێندێك رێچکەی دی هەن ، کە لە بیرێکی تایبەتی‌یەوە سەر هەڵدەدەن و لەوانەش رێچکەی نوێ‌یە ، کە بۆ رابردوو روو دەکات و هەوڵ دەدات رابردوو لە بناخەوە بگەرێنیتەوە بێ‌ئەوەی هیچ فەلسەفەیەك سنووری بۆ دابنێت ، بەڵکو گەرانەوەی بۆ رابردوو بەهۆو یارمەتی شوێنەواری جێ‌ماو لە شتومەك‌و بابەتی نووسراو بۆ ئەوەی لێ‌ی بکۆڵێتەوەو بە ووردی رەخنەی لێ بگرێت ، جا ئەوسا ئەو بابەتانەی ، کە بەم هۆیانەوە بۆیان ساخ بۆوە لە رووی ژێری‌و پێوانەی زانستەوە دەنگ‌و باسەکان راست بوون ، ئەوسا دەیان‌خاتە روو ئەلبەت دوای ئەوەی ئەو راستی‌یە تاك‌و تەرایانەی یەك بەیەکەوە دەبەستێت لەو کاتەدا دەتوانێ وێنەیەکی راستەقینەی رابردوو پێشان بدات ، لە کاتێکدا ئەم رووداوانەی بەم جۆرە دەیان‌خاتە روو ئەگەر سەد لە سەدیش راست نەبن ئەوا لە راستیەوە زۆر نزیکن .

ئەو کاتە بەسەر چوو ، کە مێژوو برێتی بێت لە گێرانەوەی دەنگ‌و باسی میان‌و رووداوان وەیا وەکو رۆشنبیریەکی گشتی تەماشا بکرێ بۆ ئەوەی مرۆڤان بۆ ژینی سیاسی‌و جەنگاوەری وهی‌دی ئامادە بکات ، بەڵکو مەبەست لە مێژوو گەیشتنە بە راستی مێژوویی خۆی‌و هەوڵ‌دانە بۆ تێ‌گەیشتن لە رابردووی مرۆڤایەتی‌و زیندوو کردنەوەیەتی‌و رێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی یەکێکە لەو بناخەگرنگانەی ، کە لێکۆڵینەوەی مێژوویی پێش دەخات . ئەگەر Historia کە ووشەیەکی یونانی‌یەو لەو کارەوە وەرگیراوە کە واتای (تەماشا کردن‌و سەیر کردن وەیا فێربوون بە رێگەی پرسیار کردنەوە) دەبەخشێت‌و هیرۆدۆت ئەم ووشەیەی کردۆتە ناونیشانی کتێبەکەی ، لە زمانی کوردیش‌دا ووشەی مێژوو واتای ئەم بابەتە دەگەیەنێت کە ئیمرو ووشەی هیستوریا دەیگەیەنێت هەرچەندە کاریگەری هێزی خوایی وەیا میتافیزیکی لەسەر سەرەنجامی مرۆڤایەتی‌و رووداوانی مێژوویی لە لایەن هێندیك مێژوو نووسانەوە دەسەلات‌دار بێت ، ئەوە مێژوو رێرەوی خۆی لەسەر دەستی ئادەمزاد بە رێگەیەکی راستەو خۆو لە بارێکی دیاری کراودا وەردەگرێ . مرۆڤ نەوەی رابردووە و لە ئەنجام‌دا بەرەی هەبوونە هەمووی .

بۆیە ئادەمزاد ناتوانێ خۆی بناسێ‌و لە ئەمرۆ خۆی بگات ، ئەگەر لە رابردووی خۆی نەگەیشتێ ، ووردبوونەوە لە رابردوو وا لە ئادەمزاد دەکات کەوا لە ذاتی خۆی دوورکەوێتەوە و ئەو تایبەتێتی‌و هەلانەی غەیری خۆی بە ئاسانی ببینێ ، کە لە خۆی‌دا نایبینێ . جا ئەوسا دەتوانی باش لە خۆی بگات‌و بە توانا تریش دەبێ لە هەڵس‌و کەوتی ئەمرۆو داهاتووی‌دا .

باوەکو ئێمە لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی مێژوویی‌دا ناتوانین یاسای زانستی چەسپاو وەکو زانستەکانی سروشتی دی بچەسپێنین ، بەلام ئەوە ئەوە ناگەیەنێت ، کەوا مێژوو لە سیفەتی زانستی بێ‌بەش بکات‌و بڵێن ئەمە زانستی تاقیکردنەوە نی‌یە ، مێژوو زانستی رەخنەگرتن‌و لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیە وەکو زانستی جیولوجیا کە هەردوویان شوێنێواری رابردوو شی دەکەنەوەو لێ‌ی دەکۆڵنەوە لەگەڵ بوونی تا کە جیاوازی‌یەك لە نێوانیان‌دا ئەوەش ئەوەیە ، کەوا مێژوونووس لە زانستەکەی خۆی‌دا ناچارەو بەڵکو پێویستە لەهۆی مرۆڤایەتی بکۆڵێتەوەو لێکی بداتەوە ، بۆ ئەوەی زێتر لە راستی مێژوو نێزیك بێتەوە ، مێژووی مرۆڤایەتی وەنەبێ هەر لەسەر یادکردن‌و تۆمارکردنی رابردوو بەند بێت ، بەڵکو ئادەمزاد خۆی بە واتایەکی دی مێژوویی‌یە ، یانی هەبوونێکی زیندووی کاریگەرە ، بەم رەنگە وەنەبێ واقع کاری تێ‌بکات ، بەڵکو ئەو کاری لێ دەکات .

لە لایەکی دی‌یەوە دەبێ ئەوەش بڵێین کەوا هەرکێ هەوڵی نووسینی مێژووی‌دا بە مێژوونووس ناژدمێردرێت ، چونکە لەو سیفەتانەی دەبێ لە مێژوونووس‌دا هەبێ خۆشەویستیی بۆ بابەتەکەو ئارامی‌و باوەر بەخۆیی راستگۆیی‌و ئازاو دلێرو دلسۆزی تێدا هەبێ‌و نابێ هیچ راستی‌یەك بشارێتەوە کەوا غەیری ئەو

نایزانن بە تایبەتی لەو راستی‌یانەی نە ئەو نە نەتەوەکەی ئەو پیی‌یان ناخۆشە ، هەروا دەبی‌ مێژوونووس رەخنە سازێکی باش بی‌ و نابی‌ بە هەموو قسەیەك قایل بی‌و باوەر بە هەموو بروا نامەیك‌و سەرچاوەیەك بکا بەڵکو پێویستە لێیان بکۆڵێتەوەو لێکیان بداتەوەو لە هەمان کاتیش‌دا دەبی‌ لە هەوڵ‌دان بۆ ناوداریێی‌و خۆ دەرخستن دوور بی‌و خەریکی بەگیر خستنی نازناوو شوێنی پایەدار نەبی‌ ، بەڵکو دەبی‌ وەکو زانایەك خاوەن ژیرو بیرێکی هۆشیاری رێك‌و پێك بی‌و دەبی‌ خۆشی لە شانازی‌کردن وەیا حەز لێ‌ نەکردن لە سەردەمێکی دیاری خراوی مێژوویی ئازاد بکات .

بەم جۆرە رێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەو قوناخانە دەگرێتەوە کە لێکۆڵەرەوەی خاوەن ئەو سیفەتانەی لە مەوبەر باسکران پێیدا تی‌دەپەری‌ بۆ ئەوەی بەپێی توانا بگاتە راستی مێژوویی ، ئەم قوناخانەش پێویستیان بە رەوشەنبیری پێویست هەیە جا هەڵبژاردنی بابەت‌و کۆکردنەوەی یاساو سەرچاوو چەسپاندنی راستی‌و بە دیارخستنی کەسیەتی نووسەرو بە دیار خستنی کات‌و شوێنی تۆمارکردن‌و پشکنین تێکست‌و دانانی سنوور لە نێوانیان‌داو هەروا رەخنە لی‌ گرتنێکی بابەتانەو چەسپاندنی راستی مێژوویی‌و رێك خستنی‌و لێکدانی‌و نواندنی زیرەکی‌و توانایی تێیداو جا دانانی شێوەیەکی مێژوویی‌و پێشان‌دانی بە جۆرێکی مێژوویی رێك‌و پێك .

بەم جۆرە لەسەر ئەم بنچ‌و بنەوانەی خوارەوە سنوور بۆ نرخی مێژووی نووسراو دادەندرێت :

١ – دەبی‌ ئەو بابەتەی ، کە تۆژەر (باحث) زانیاری لی‌ وەرگرتووە باش تەماشا بکری‌ .

٢ – سنووردانان بۆ نرخی مێژووی نووسراو لەسەر توانای تۆژەر بۆ باس‌و تۆژینەوەو لێکدانەوەو رەخنەگرتن لەو سەرچاوانەی لە ژێر دەستی‌دان دەوەستی‌ .

٣ – هەروا نرخی بابەتە مێژوویی‌یەکە لەسەر دوور بوونی تۆژەر لە لایەنگیری کردن دەوەستی‌ .

لە پاڵ ئەو بناخانەی لە سەرەو باسکران زانستی مێژوو ناتواندری‌ بە تەنیا بە شێوەیەکی سەربەخۆ دوور لە زانست‌و زانیاری دی لی‌ی بکۆڵدرێتەوە ، بەڵکو بۆ لێکۆڵینەوەی هێندیك زانستی دی یارمەتی دەری هەن ، وەك زانستی زمان (فیلۆلۆژی‌یا) جۆری نووسین (پالیوگرافی‌یا) و بروانامە (دپلوماتیك) ، مۆرو رنوك (ئەو نیشانانەی ، کە لەسەر مۆرو جل‌و بەرگی خانەدانان‌و سەربازان‌دا هەڵکەندراون)(نومیسماتیك – زانستی پارەو دراوو مەدالی‌یە) و ئەپیگرافیا (لێکۆڵینەوە لە نەخش‌و نیگاران) و کرونولوجیا ( بەدیارخستنی بەروار بە ووردی بۆ رووداوان بە پێی کاتی روودانیان)و جوگرافیا ، ئابوری ، وێژەیی ، هونەری نیگار کێشان ووێنەگرتن وپەیکەرتاشین خانوو بەرە دروست‌کردن‌و هونەرانی موسیقا ، شوێنەوارو زانستانی دی .

بەلام داوا لە مێژوونووس ناکری‌ ، کەوا خاوەن چەند بەهرەیەکی تایبەتی بی‌ بۆ ئەوەی بتوانی سنوور بۆ ئەسل‌و قۆناخی کاتی پارچە گلێنەیەك وەیا مەرمەرێك دابنی‌ وەیا بتوانی‌ نەخش‌و نیگارانی لێل‌ بخوێنێتەوە وەیا حسابیکی بیری دوورو درێژ بکات بۆ ئەوەی بە رواری تەواو بچەسپێنی‌ . ئەو راستی‌یانە ، کە بە راستی بنچینەیی مێژوو دەژمێردرێت لەلای هەموو مێژوو نووسانەوە بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەو شت‌ومتە خاوانە دەگەرێنەوە نەك بۆ خودی مێژوو خۆی‌و چەسپاندنی ئەو راستیانەش لە بنەرەتەوە وەنەبی‌ لە سەر جۆری راستێکان بوەستی بەڵکو لەسەر بریاری مێژوو نووس دەوەستی‌ ، کە دەبی‌ پێشتر ئامادەی کردبی‌ نەزانینی بابەت پیویستی یەکەمی مێژوونووسەو ئەو توانایە زۆرەی کە لەلایەن نووسەرانی مێژووی کۆن‌و نێوەراست هەڵ‌دەکەوی‌ هەر لە بنەرەتەوە بۆ ئەو نەزانینە دەگەرێتەوە بۆ ئەو بابەتانەی ، کە دەیان نووسن ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو دیاردەیەبوو کە لە سەدەی نۆزدەم دا باوبوو وکە دەڵی‌ مێژوو برێتیە لە کۆمەڵێك راستی بابەتانەی کە هەرگیز رەت ناکرێنەوە . ئەو راستی‌یانەی بە پیرۆزێکی کوێرانە تەماشا دەکران‌و لەم سەدەیەدا باو بوو بیانووی تایبەتی خۆشیان بۆ ئامادەکردبوو ، بۆیە هەرچ مێژوونووسێکی بەرێز دەبا بەسەر شۆرێکەوە لی‌نێزیك دەبۆوەو زۆر بە شکۆوە باسی دەکرد چونکە ئەو راستی‌یەی لەنێو بروانامەکان دا هەیە هەر راستی‌یە هیچتر ئەو رابردووەی ، کە مێژوو نووس لی‌ دەکۆڵێتەوە وەنەبی‌ رابردوویەکی مردوو بی‌ ، بەڵکو رابردوویەکە هێژ لە ئەمرۆش دا دەژی ، بەلام ئەو رووداوانەی ، کە لە رابردوودا روویان داوە رابردوویەکی مردوون ، بەواتا هیچ مانایەك بە مێژوو نووس نابەخشن ئەگەر بێتو لە بیری ئەو رووداوە نەگات کە بۆتە هۆی رووداني .

لەمەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ، کەوا مێژوو بەتەواوی مێژووی بیرەو مێژووش دووپات کردنەوەی ئەو بیرەیە لە هۆش‌و یادی مێژوونووس‌دایە بۆئەو ، بابەتەی لی‌ دەکۆڵێتەوە ، کە

ئەمەش وەنەبێ هەرگێرانەوەی راستی بێت ، بەڵکو بەپێچەوانە پرۆسێسی دووبارە کردنەوەی دروست‌بوون دووبارو کردنەوەی هەڵبژاردن‌و لێکدانەوەی راستی‌یە ، ئەمانە وا لەو بابەتە دەکەن ، کەوا ببنە راستی‌یەکی مێژوویی .

وەنەبێ ئەو راستی‌یانەی بە ئێمە دەگەن راستی‌یەکی بێ کارلێکراوی بن ، چونکە راستێکان هەمیشە بەهۆی بیری تۆمار کەرەوە رەنگ دەداتەوە ، بۆیە نابێ بەر لە هەموو شتێك بایەخ بەو مێژوونووسە بدەین کە نووسیویەتی لە کاتێك دا کە دەبێ بایەخ بە خودی راستێکە خۆی بدەین . ئەمەش وا دەکا کەوا مێژوو نووس پێویستە لەبیرو هۆشی ئەو کەسانە بگات ، کە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات‌و لەو بیرانەیان نێزیك بێتەوە کەهۆی کاروکردەوەیان‌و بە هیچ جۆرێکیش نابێ سۆزێکی بەرامبەریان هەبێ ، نابێ ئەوەش لەیاد بکەین ، کەوا مێژوونووس کوری سەردەمی خۆیەتی‌و پێوەی پێوەست دارە بەپێی مەرجەکانی بوونی مرۆڤایەتی ، بەلام مێژوونووس هەمیشە دەپرسێ (بۆ ؟) ولە تواناش دا نی‌یە بیری بوەستێنێ مادام چاوەرێی وەلامێك دەکات هەر ئەوەشە وا کەلە مێژوونووسان دەکات کەببنە بیرکەرەوەیەکی مەزن .

هیرودوتوس لە سەرەتای کارکردنی دا سنووری بۆ مەبەستی خۆی داناوە بەوەی بیرەوەری کردەوەکانی یونان‌و بەربەرەکان بپارێزێ‌و « بەتایبەتی‌و لە سەرووی هەموو شتێکەوە هۆیەکانی رووداوی جەنگ لە نێوانیان دا پێشکێش بکات) هێندێك لەو مێژوونووسانەی ، کە مێژووی رۆمانیان بە چەند سەدەیەك لە دوای ئەو تۆمار کردووە بابەتەکانیان لە هۆیەکی راست‌و رووناك بێ‌بەشەو هەژارە ، بەلام رۆژگار ئەوەی بۆ فەیلەسوفانی مێژوو روون کردەوە ، کەوا ماندووبوون بۆ هەوڵدانی رێکخستنی تاقیکردنەوەی رابردووی مرۆڤایەتی بەهوی دەرخستنی هۆیەکانی رووداوانی مێژوویی‌و ئەو یاسایانەوە دەبێ ، کە لە فەرمان رەوایی دا پێرەو کراون لەو کاتەدا یاساو هۆ بە شتێکی میکانیکی دەژمێردراو هێندێك جاریش بە بیولوجی وغەیبی‌و ئابوری‌و دەروونی بەلام لە لایەکی تیوری‌یەوە ئەوەی باو بوو مێژوو لە کۆمەڵێك رووداوانی زابردوو پێك‌هاتووەو لەسەر هۆو ئەنجام بنیات نراوە ، لێرەدا شوێنی خۆیەتی بڵێین پولیبیوس یەکەمین مێژوونووسێکە ، کە بایەخی بە مێژووی رۆمان داوە بەم جۆرە رێبازە و تاکیتوس ، کە مێژووی لاوازی وولاتەکەی خۆی تۆمار کردووە ، یەکێك بووە لەوانەی پێرەوی ئەم رێبازەیان کردووە .



لەبەر رۆشنایی ئەو پێویستی‌یانەی لەمەو بەر باسکران‌و بەپێی ئەو بارو دۆخەی کە مێژووی کوردو نیشتمانی کۆنینەیان تێیدایە دەبێ وا لە بابەتەکە بدوێین ، کە بە دوو قۆناخی گرنگەوە پێوستە :-

١ - ئەو قۆناخە دەگرێتەوە ، کە لە پێش پەیدابوونی نەتەوەی کورد لەسەر شانۆی رووداوانی مێژوویی دا وەکو کۆمەڵە مرۆڤێکی جیاواز کەوتووە ، ئەم نەتەوەیە رۆڵێکی مێژوویی تایبەتی هەیەو هانمان دەدا بۆ ئەوەی لە شوێنی نیشتەجێ‌بوونیان بکۆڵینەوە کە پرە لە کەلەپووری مێژوویی‌و لە راستیش دوور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین نووسەرانی چەرخی کۆن‌و نێوەراست لە لایەنی ئەو راستی‌یە دوور نەکەوتوونەتەوە کە بایەخێکی بێ‌سنووریان داوە بەو ناوچەیەو وەکو شوێنێکی پیرۆز تەماشایان کردووە چونکە کەشتی پەیامبەر نوح لەم هەرێمەدا رووهێڵدراوە .

ئەم هەواڵە لەلایەن سومەریانەوە گێردراوەتەوەو ئاشورێکانیش روونیان کردۆتەوە ، جا نیکۆلای دیمەشقی‌و ئیفانوس‌و ئیسکەندەری پولهیستور و ئوزابیۆسی قەیسەری‌و هەروا یوسیفوس فلاڤیوس ئەوەیان روون‌کردۆتەوە ، کەوا ئەم کەشتیە لەسەر کێوەکانی کوردوێنێ وەستاوە .

٢ - ئەو قۆناخە دەگرێتەوە ،کە چەند گۆرانێکی کەلچەری وزمانەوانی لە سەردەمی دەولەتی میتانی‌و میدی دا روودەدات وهەر لەم پلەیەدا هەموو مەرجێکی پێویست‌بۆ پەیدابوونی نەتەوەی کورد دێتەکایە ، کە دەتواندرێ پشت بەو سەرچاوانە ببەسترێت بەهۆی ئەو رێبازە باشەی ، کە کۆمەڵێك لەنووسەرانی یونان‌و رۆمان پێرەویان کردووە لەپاڵ ئەو دەکومێنتە تۆمار کراوانەی ، کە ئەم دەولەتە ناوچەییانەی جی‌یان هێشتووەو

هەروا دەتواندریٚ دەسنووسانی کەنیسەکانی ئەم ناوچەشیان بخریٚتە سەر .

ئەمەو لەلایەنیٚکی دی‌یەوە ئەو بابەتانەی یارمەتی ئەم جۆرە لیٚکۆڵینەوەیە دەدەن دابەش دەکریٚنە سەر دوو شیٚوە :

١ – سەرچاوەی ویٚژەیی (ئەدەبی) ، کە نووسراوی پاشاو قەشان دەگریٚتەوە لەگەڵ ئەو نامە میریانەی کە لە نیٚوانیان‌دا ئاڵ‌وگۆڕکراون هەروا راپورتی سوپاسی هی لەشکرە جیا جیاکان ، کە توانیویانە ئەم وولاٚتە بخەنە ژیٚر دەسەلاٚت داریٚتی خۆیان کە لەکۆن‌دا بەگشتی ناوی چسوپارتو) لەلایەن سومەریان‌و (علیاتم) لەلایەن ئەکەدیان لیٚندراوە وهەروا بەناوی کوهستانیشی لەسەردەمی درەنگتر هاتووەو کە وەرگیٚراوەکەی بۆسەر زمانی عەرەبی (بلاد الجبل) بووە .

٢ – سەرچاوەی ناویٚژەیی ەکەهەموو شویٚنەوارو نەخش‌و نیگار و دراوی وشتی دی میٚژوویی .

لیٚرەدا بەپیی‌ی ئەوکاتەء ، کە بۆم رەوایەو بەشیٚوەیەکی کورت باسی هیٚندیك سەرچاوەی میٚژوویی ویٚژەیی دەکەم ، کە بەقوناخیٚکی کورتی دیارخراوی میٚژووی کوردەوە بەندیواری هەیە ئەم باسەشم دوو لایەنی ئەم سەرچاوانە دەگریٚتەوە ، کە ئەوانیش دەسنووسەکانی یونانی‌و رۆمانین‌و لەگەڵ هیٚندیٚك دەکومیٚنتی ناوچەیی ، کە لەو سەردەمەدا هەبووەو بەهۆیەوە دەتواندریٚت هیٚندیك لە دیاردەکانی قۆناخەکە روون بکریٚتەوەو پەیوەندیٚکەشی بەپەیدابوونی نەتەوەی کوردەوە پیٚوەستە ، بەلاٚم لە چوارچیٚوەیەکی سنووردارا لەپیٚش پەیدابوونی دینی مەسیحی‌و لەدوای ئەو سەردەمەی ، کە هیرۆدۆتس کتیٚبیٚ (هیستوریا – میٚژووی)ی تیٚدا نووسیوە .

أ – لە راستی‌دا هیرۆدۆتس زۆر بە ئاشکرادروون باسی وولاٚتی (ماتیینی) و هەروا ناوچەی پەختەویٚخ (بوهتان) دەکات ، کە کەوتبوونە نیٚو ساتراپی سیٚزدەمی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی (Her .III , 93) ولەدواییدا وەکو ناوچەیەکی جوگرافی مرۆڤایەتی بوو بە مەڵبەندی کۆبوونەوەی گەلی کورد ، بەلاٚم ئەو نەیگوتووە کورد بەڵکو بەنیٚوی (ماتیینی (Matienoi نیٚوی بردوون . لە دوای ئەودا بەنیو سەدەیەك کسینەفۆن تیشکیٚکی رووناکتری خستۆتە سەر ئەو ناوچانەو بەتایبەتی لە ئانابا سیسی ، کە لەدوایی‌دا بووبە دەکومیٚنیتیٚکی میٚژووی گرنگ ، کە هیچ دەکومینیٚتیٚکی دی لەو سەردەمەدا ناتوانی بەرامبەر بوەسیٚ‌و لەبەر ئەوەی نووسەرەکەی بیرنیٚکی فەلسەفی هەبووەو خویٚندکاریٚکی سوقرات بووە ، لەگەڵ ئەوەش‌دا پیاویٚکی سوپایی سەرکەوتوو بووە توانیویەتی سەرۆکایەتی لەشکری خۆی و بە شیٚوەیەکی راست‌ورەوان بەرەو وولاٚتی یونانی بەریٚ .

ئەم دوو میٚژوونوسانە باسی کۆمەلیٚکی تایبەتیان لە وولاٚتی ماتیینی‌دا نەکردووە ، کە کەوتبۆ نیٚوان رووباری ئاراکس هەتا سنووری وولاٚتی میسوبوتامیا ولەگۆمی وورمیٚوە ، کە بە گۆمی ماتیینیش نیٚودارەبوو تا گۆمی وان . لەبەر ئەمەو لەبەر چەند هۆیەکی دی بەهیچ جۆریٚك ناتوانین بریاریٚکی بنج بربدەین لەسەر هەبوونی هەموو مەرجیٚکی نەتەوایەتی کوردی لەو کاتەدا (لەسەدەی پیٚنجەمی پیٚش‌زایین) ، بەلاٚم ئەوە ئەوە رەت ناگاتەوە کەوا بلیٚن ئەو دانیشتوانەی ، کە بە ناوانی جۆراو جۆر ناو نراون بە تۆی گەلی کورد بژمیٚردرین ، وەکو کاردۆخۆی ، هۆزەکانی میدی جۆراوجۆر ومیتانیانی کۆن کیرتی ومەردیان‌و دەیلەمی‌و هەتا سەکسی‌و ئالانیش ، لە ناوەراستی بوونی ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەدا ناوی وولاٚتی (گۆردویٚنی) سەرهەڵ‌دەدا ، کە لە هیٚنیدیك سەرچاوەدا لەشیٚوەی (کۆردویٚنی) هاتووە لەگەڵ هاتنی ئیسکەندەی مەکدونی لە کۆتایی سەدەیٚ چوارەمی پیٚش‌زایین ، لەدوای ئەم سەردەمەدا دیسانەوە لەلایەن سترابون ، پلینیوس وئەمیانوس مارکلینۆس‌و هی‌دی یاد دەکریٚنەوە .

بەلاٚم دیودورۆسی سیسلیانی (لەدەوروبەری ٨٠ پ .ز . ٣٠ پ .ز .) کاتیٚ پەرتووکەکەی خۆی ، کە بەنیٚوی (کتیٚبخانە میٚژوویی (Bibliotheke یە دابەش کردووە و لەنیٚوی‌دا چارەسەری ماوەی نیٚوان سەردەمی ئەفسانەیی هەتا ٥٩/٦٠ پ .ز .دەکا ، لەم ساڵەدا تەبایی‌و ریٚکەوتن سیٚ قۆلی لە نیٚوان (نیٚوان پۆمپەی وقەیسەرو کراسوس) رووی دا کە بە یەکەم هەنگاوی گۆرین لە میٚژووی کۆماری رۆمانی دا دەژمیٚردریٚ نووسەری نیٚوبراو باسی کارودوخۆیانی کردووە وئەو سەرچاوانەی کە پشتی پی‌بەستوون دەبیٚ کسینفۆن وەیا هاوبەشیٚکی دی هیٚرشەکە (وفاینیتوس) بیٚ کە ستفانی بیزەنتی ووتوویەتی ئەویش ئاناباسیس خۆی نوسیوەو باسر کاردوخۆیانی (Diod .XIV 27) مردووە . نوسراوی (نامەخانەی میٚژوویی) بریٚتیە لە (٤٠) کتیٚب بەلاٚم تەنیا کتیٚبی ١–٥ ، ١١–٢٠ وهندیك بەشی (٢١–٤٠) ئەم بەرهەمەمان دەست‌کەوتووەو لەنیٚو نووسراوەکانی میٚژوونووسی کەنیسی ئوزابیوس قەیسەری‌و لەگەڵ نووسرەانی سەردەمی بیزەنتی هاتووە . دیودورۆس زانیاریٚکانی خۆی لە

مێژوونووسێکی زۆری پێش‌خۆی وەرگرتووە وەکو هیکاتیوس‌و ئیفوروس‌و ثیوپومپوس‌و کلیتارخوس‌و هیرونیموس‌و تیمایوس‌و هێندێك نوسەرانی (Annales)ی رومانی وەکو پولیبیوس‌و پوسیدونیوس .

بەلاّم پلینیوسی مەزن (۲۳ز . – ۷۹ز .) کە بەسەرۆکی هێندیك بەشی هێزی زەریایی داندرابوو وەلە پێناوی زانستی‌دا لەوکاتەی کە دانشتوانی ناوچەی کێوی ڤیزۆڤ لەبەر بورکانی ئاگراوێکەی دەگواستەوە شوێنێکی دی دوا مال‌ئاوایی لە جیهان کرد وئەم رووداوەش لە سالّی (۷۹)ی زایینی‌دا بوو .

نێوبراو زانایەکی ئینسوکلۆپیدی بوو ، کە ئەو بابەتانەی لەنێو بەرهەمەکەی دا باسی کردوون ، زانیاری سوپاسی و مێژوویی‌و فێرکەری زمانەوانی بوون ، ژمارەی بەرهەمەکانی (۱۰۲) کتێب‌بوون تەنیا یەکێکیان ماوەتەوە ، کە ئەویش (مێژووی خۆرسکی – Naturalis Historia) یەو ئەم ئینسوکلوپیدی‌یە (۳۷) پەرتووکەو لە زانیاری جوگرافی ، رەگەز ، زنجیرەی مرۆڤایەتی ، پیشەی ئەندامان وزانستی حەیوان‌و رووەك ، دەرمانخانەو کانەکان‌و نووسەرانی یونان‌و رۆمانی وەرگرتووە ، ئەم زانایە لەنێو نووسراوەکانی تۆمار کراوی‌دا دەلّیٚ کاردوخۆیانی کۆن ، کە لە سەرووەمی خۆیان بە کوردوێنی نێوداربوون دراوسێی وولاّتی حەذیاب (ئەدیابینی) – هەولێر – بوون ، ئەم زانیاریە لایەنی شوێنی جوگرافی کوردوێنی دەگرێتەوەو هەروا باسی وولاّت‌و کێوەکانی گوردوینی (Plin n.h.v1 44) دەکات ، بەلاّم پتلیموسی (۳۵ پ.ز. – ۸۲٤ پ ، ز) دامەزرێنەری زنجیرەی پەتلیموسەکانە لە میسرداو کە سەرۆکێکی سوپاکەی ئیسکەندەری مەکدونی بوو ، لەکاتی خۆی‌دا جیاوازی لە نێوان وولاّتی گۆردوێنی‌و شاخەکانی گۆردوای کەردوخۆیانی کردووە (Ptolemaius v 12, 2) و (v1 2, 5) ، ووتەکانی ئەم نووسەرە بێگومان لەوانەی پێش خۆی نزیکترە لە راستیووە ، چونکە ئەگەر هەرنەبێ هاورێگەی ئیسکەندەری مەکدونی بووە ، ئەگەرچی بە نێو وولاّتی کاردوخۆیان پیٚ‌نەپەریون ، بەلاّم بەلای چەپی وولاتی گوردیای رۆیشتوون کاتی رووباری دجلة لە نێزیك فیشخابور (پێش خابور)ی ئەمرۆیان بریوەو جا بەرەو گوندی گوگمیلای نێزیك هەولێر رۆیشتوون . ئەم دەنگ‌وباسە لەلایەن ئەریانوس‌و کورتسی روف وپلوتارخوس دوویات کراوەتەوە (Arrian anab, II 17, 7. Curt IV 10, 8, Plut, Alex 31, 4) لەسەدەکانی دوای هێرشی ئیسکەندەردا شوێنی ئەم وولاّتە بە ووردی دەست‌نیشان نەکراوەو سنووری بەدیارنەخراوە . ئەگەرجی سترابون (Strabox 1, 2, 4)ی جوگرافی گوتویەتی گوردونیی لە پێش‌دا بە کاردوخۆی ناسرابوون‌و هێندێکیشیان لە تووروس و سوفینی و ئەرمینیادا ژیاون ، بەلاّم لەشوێنێکی دی (Strabo XVI 1, 24) کە سنوور بۆ ناوچەی گۆردیای دادەنیٚ دژی خۆی دەوەستیٚ لەو تێکستەی لەنێو کتێبی دووەمی جوگرافی‌یەی‌دا لە شوێن‌و رووگەی رووباری دجلەی کردووەو هەرئەم تێکەلّی‌یە لە لایەن یولیوس هونوریوسەوەش دوویات کراوەتەوە . بەلاّم ئەوەی لێرەدا گرنگەکە سترابون سیٚ شاری گۆردوینی (ساریسا – شیریشی ئەمرۆ لەنێزیك توری عابدین)و (ساتالکا) و (پیناکا – فێنکی ئەمرۆ) پە لە جوگرافی‌یەکەی خۆی‌دا شوێنیانی پێشان‌داوەو لەلایەن هیندیك مێژوونووسانی دیشەوە دووبات کراونەتەوە لەهەموویان نێودارتر ئەومێژوو نووسە یونانیە ، کە ئەفسەری لە شکری رۆمانی بوو نێویشی ئەمیانۆس ماریکتۆسە (۳۳۰ز – ٤۰۰ ز) ە ووتەکانی ئەم ئەفسەرە گرنگێکی تایبەتی مێژوویی هەیە ، کە بە وولاّتی کۆردوێنی بەندیواری هەیە ، چونکە ئەم نووسەرە خۆی لەبەر چەند هۆیەکی سوپاتی کاتێکی درێژ لە وولاّتی کوردەواری‌دا گەراوە و هێندێك جاریش گەیشتۆتە ئەو ناوچانەی کە لە دەوروبەری زێی‌گەورەن لە باکووری هەولێردا هۆی گە یشتنیشی بۆ ئەم شوێنانە شوێن پیٚ‌کەوتنی کاروانی هێزەکانی ساسانی بوو ، ئەوەی شایەنی باسە شاری ئامید (دیاربکر) کە مەلّبەندی وولاّتی کوردوێنی بووە ، مەلبەندی سەروکایەتی ئەم جورە ئەفسەرە رومانیانەبوو لە دوای جەنگێکی خوێناوی لەوولاّتی کۆردوینی بەتایبەتی لە امد دەگەرێتەوە روماو لەوی دا دەست بە نووسینی بەرهەمەکەی (resgestate) دەکا ، کە ۳۱ کتێب بوو وتەنیا (۱۸) لیٚ ماوەتەوە (لە ١٤ – ۳۱) خۆش‌بەختان ئەو بەشانەی ماونەتەوە پرن لە تێبینی‌و سەرنجی کەسی خۆی وبەشێوەیەکی خۆش‌و رەوان رووداوەکانی جەنگی زۆر بەواقعی‌و سەراحەت دەگێرێتەوە ، خۆشترین رووداوێکی تۆماری کردووە ئەو ئابلوقە دانەی شاری ئامیدە لە نێوەراستی سەدەی چوارەمی پێش‌زایین‌و بەتەواوی لە سالّی ۳۵۹ زایین‌دا ، لە کاتێك دا ، کە جوڤینین Jovinien فەرمان‌رەوای شارەکە بووە . نووسەر نەخشەیەکی راستی ئەو ناخۆشی‌و وێرانە مالّی‌یەی دانیشتووانی شارەکەی ، کە کورد بوون دووچاری‌بوون لەگەل بە لەشکری رۆمانی کێشاوەو جونکە لادیٚ‌یەکان بۆ

پێك هێنانی بازێری سالانەیان لەنێو شاردا کۆبیبوونەوە ماریکنیۆس دوا رۆمانی دووربینی باوەر بەخۆبوو ، ئەگەرچی لە سالانێك دا ژیا ، کە رۆشنبیری لەوپەری بی هێزیبوو و هاوبەشی خەم و پەژارەی کوردانی کردووە ، کە لەئەنجامی شەرەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت دا دیلی بوو بوون .

ئەگەرچی ئەو ناوچانەی لەسەر هەردوو لێواری زێی گەورەدابیون لەرووی کارگێریوە نەکەوتبوونە نێو چوارچێوەی وولاتی کوردوێنی لەپێش رووداوەکانی مارکلینۆس ، بەلام گۆرانکاری زمانەوانی و کەلچەری لەم ناوچانەو لە دەوروبەری هەولێردا روویان دابوو ئەوەش لەسەردەمی میدیەوە دەستی پی کردووەو گەورەترین بەلگەی ئەم گۆرانەش نیشتەجێی ساکیان بووە ، کە بە شاران – هیلینا – نێودا ترین کەسە ، کە لەگەل ئیزاێستی یەکەما لە دینی خۆیان هەلگەراونەتەوەو بوونەتە جوولەکەو لە ئەنجام دا دینی وولاتەکەشیان بۆسەر ئەم دینە گۆریوە .

فلافیسوس یوسیفوس (یوسفی کوری ماتیاس) باسی لایەنێکی ئەم رووداوانە دەکات ، ئەگەرچی ئەم مێژوونووسە لە فەلەستین لە سالی (٣٧)ی زایینیدا هاتۆتە گێتیەوە و لەبەر هیندیك هۆ خزمەتێکی زۆر دلسوزانەی رۆمانی کردووە ، بەلام ئەمە رێگەی ئەوەی لێ نەگرتووە ، کەوا ببێتە پیاوێکی رامیاری ، جەنگاوەرو دوانبێژو مێژوونووس ، چوار بەرهەمی بۆمان بەجێ هێشتووە لەهەمووی گرنگتر (جەنگی جوولەکان) ، کە لە سەرەتادا بە زمانی ئارامی نوسراوە جا وەریانگێراوەتە سەر زمانی یونانی ، ئەم بەرهەمەی لەهەموو بەرهەمەکانی دی کاریگەرترە و لەنێو سەرچاوەکانی دی ئەم سەرچاوەیە بە بەرهەمێکی تەواوی مێژووی رۆمان دەژمێردرێت ، هەروا باسی فەرمانرەوایەتی سەکس و ئەو زرووفانەی کە ناوچەکە تێیدا دەژیان دەکاو دیسانەوە باسی چۆنیەتی دانی وولاتی کوردوێنی لەلایەن مونابازوس ەوە بۆ ئیزاتیسی دووەمی کوری لە بەشی یەکەمی سەدەی یەکەمی زایینیدا دەکات .Joseph. Aut) (I93 . ئەم سەکسانە دەورێکی بالایان لە پەیوەندی زمانەوانی و ئەتنوگرافی گەلی کورددا هەبووەو بەتایبەتی لە هێندێك ناوچەی وولاتەکەیانو لە شارانی وەك هەولێرو پردی (شەرکرت)و کەرکوكو تێوی خۆشیان لە شاری سەقزدا هێشتەوە . بەم جۆرە کۆمەلێك لە مێژوونووسانی یونانی و رۆمانی تیشکیان خستۆتە سەر باری رامیاری و سوپایی بەری رۆژهەلاتی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی ، کە وولاتی کوردوێنی دوا سنووریان بوو لەگەل دوژمنەکانیان – رۆژهەلاتیان بەشێك لەو راپۆرتە سوپایی ریك وپێکانەی ، کە بۆ شوێنانی بالا نێردراون بوونەتە سەرچاوەی بابەتەکانیان بۆ وێنە کاسیوس دیوکاسیانوس (١٥٥ز – ٢٣٠ز) بە یارمەتی تۆمارەکانی باری میری ، کە ئیمپراتورەکان رێگەی بەکارهێنانیان داوە بەرهەمە مێژوویەکەی خۆی نوسیوە . لەپێش ئەمەش دا لەگەل ئیمپراتۆر – کرا کللا لە سالی (٢١٦ز) دا بۆ هێرشەکەی بۆسەر رۆژهەلات تەمبراتوریەکەی بووە ، بەلام دەنگ وباسەکانی گشتی بە راستی و دلسۆزی باس کردووە ، بۆ وێنە دەلی : «ترایان لە وولاتی کاردونوندا رووباری دجلەی بریوە» و ئەم ووتەیەی نیشانەیەکی جوگرافی و مێژوویی گرنگە ، باوەکو گۆرانێکی زۆر بەسەر ئەم ناوەو شوێنی لەلای سیکتوس روفوس رووی داوە کە ئەم ناوە بۆ شێوەی کاردوین جا کوردوین گۆراوە .

لەکاتی رێك کەوتنی گالیریوس و دیوکلیتیانوس و نەرسی ساسانی لە سالی (٢٩٧ ز) دا ئەوەی دواییان پێنج هەرێمی خۆی بۆ رۆمان بەجێ هێشتوە ، کە کاردوینون (کە کاردوینی پێشوون) شی بەکێك بوو لەو پێنج هەرێمەو رووباری دجلە بوو بە سنووری نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتەکە .

ئەگەرچی لەوکاتەدا مەرجی نەتەوایەتی لە وولاتی کوردوێنی دا تەواو ببوو ، بەلام هێندێك هۆزی کۆچەر لە یاسای ئابوری و زمانەوانی لە وولاتی کوردوێنی سەربەست و ئازاد بوون ، لەگەل ئەوەش دا ئەو هۆزانە لە کۆتایی دا توانەوەو بەشێکی فراوانیان لە نەتەوەی کورد پێك هێنا ، لە هەمووان گرنگتر کیرتین ، کە تیتوس لیفیوس (٥٩ ز – ١٧ر٠) وەکو هۆزێك باسیان دەکات ، کە وەکو هێزێکی نانیزامی لەنێو لەشکری سلوقی و رومانی دا لەکاتی جەنگیاندا لەگەل پێرگامۆن بەکارهاتوون . لیفیوس بە مەزنترین نووسەری رۆمان دەژمێردرێت ، کە شیوازە ئەدەبێکەی بەسەر نووسینەکانیدا زال بووە و بە وێژەوانێکی گەورە دەژمێردرێت بەرلەوەی مێژوونووسێکی مەزن بێت و هیچ کەسێك نەی توانیوە شان لەشانی بدات لەکاتی وێنەکێشیانی ئەو رووداوو ئەو کەسانەی ، کە لەنێو نووسینەکانیدا لە باسکردنی مێژووی رۆمادا پەنجەی بۆ درێژکردووەو ئەم بەرهەمەش (١٤٢) کتێبەو تەنیا (٣٥) مان بەدەست گەیشتووە .

لە سەدەی یەکەمی پێش زایین دا پاشایانی سەربەخۆ فەرمانرەوایی وولاتی کوردوێنی یان کردووە ، هەروا لەکاتی

جەنگی دووهەمی میژا داتی پورتیدا کاتیّ لوکولوس هیّرشەکەی خوّی بردە سەر ناوچەکە (زاربیونوس) فەرمانڕەوایەتی وولاّتی کوردوینی دەکرد ولەکاتی داگیرکردنی وولاّتەکە لە لایەن رۆمانەکانەوە فەرمانڕەوا یەتی ئەم هەریّمە درا ئاریّو بارزانی کەپروکی . لە ئەنجامی تیّکەلاّوی راستەوخوّی نیّوان ئیمپراتوّریەتی ٔ رۆمانیو لە دوایی‌دا بیزەنتی لەگەلّ وولاّتی کوردوینیدا ، کە هەمیشە ئەم وولاّتەش مەیدانی جەنگی هەمیشەیی بوو بوّ هەردوو لایان ، رۆمانەکان توانیان شارەزایی لە کاروباری جوّراو جوّری ئەم ناوچەیە پەیدابکەن لەوانە شیّوەی چاككردنی شکانی ئیّسك ئەندامانی تەن بە شیوەی کوردەواریو بەتایبەتی بەهوّی (ئاموموّم) کە ئیّستە لەکوردی‌دا بە مومیایی وەیا مومنایی ناسراوە ، هەر بوّیە سللوسیتوس کریسپوس (٨٦ پ . ز – ٣٤ پ . ز) کە بوّ خیّزانیّکی مسکیّن دەگەڕایەوە بشتگیری یولیوس قەیسەری دەکرد قسەکەی دەکات بەوەی کە دەلّی ئاموموّم لە وولاّتی کوردوینی دا هەیە . هەروا یوسیفوس فلاڤیوسیش لەسەر ئەم باسە سوورە .

بەم جوّرە دەتواندریّت بشت بە نووسراوانی زوّری دی بەستریّت بوّ ئەوەی لایەنەکانی ئەم سەردەمە نەکوّ لەراوەیە لە میّژووی کورددا چارەسەر بکریّت بەو ریّگەو ریّبازەی ، کە لەمەوبەر باسکرا .

ب) لەو بروانامە ناوچەیی‌یە گرنگانەی ، کە لەهەمان قوّناخ‌دا بوّ لیّکوّلّینەوە سوودی لیّوەردگیریّ کانخەزی بەردی‌یە ، کە بەیونانی (توماریون Tomarion) لە زمانی کوردی‌دا بوّ (توّمار) کورت کراوەتەوە دەوریّکی گرنگی هەیە وەکو ئەوانەی پیّشوو . ئەم جوّرە کانخەزانە ئامرازیّکی باوبووەبوّ توّمارکردنی تیّکستی میّژوویی و کوّنترین جوّینەتی دروستی‌کردنی لەلایەن پلینیوسی مەزنەوە باسکراوە . کە لەو رەگە لیجەی قەدی رووەکی بەردی دروست کراوە لەدوای پروّسیسی هیّزخستنەسەر چەند توّیژیکی ئەم قەدە بەشیوەی ئاسوّیی هەتا ئەم بەشانە بەهوّی ئەو لیجە بە یەکەوە دەنوسیّن و لەبەر هەتاو بەجیّ‌دەهیّلّدریّ هەتاوەکو ووشك دەبیّ بەم جوّرە ئەم کانخەزە بوّ نووسین ئامادە دەکراو رەگەکانیشی بە شیّوەیەکی ئاسوّیی لەسەر رووی دیار دەخرا .

نامەی تایبەتیو بابەتی ژمیّریاریو بروانامەی میریو یاسایی وهی‌دی لەسەر ئەم جوّرە کانخەزانەدا توّمارکراونو لە ناوچەی هەورامان دا سیّ پارچە کانخەز دوّزراوەتەوە ، کە یەکیّکیان بە ریّنوسی ئارامیو نیّریکەی (٣٠) سی ووشەی کوردی تیّدایەو



ئەمروّش بەکاردیّ وهەروا (١٠) دە ووشەی ئارامیشی تیّدایە وبەرواری توّمارکردنی ئەم بروانامەیە ، هەروەکو لەسەری نووسراو بوّ مانگی ئاروتات سالّی (٣٠٠) سیّ سەدی یونانی بەرامبەر بە (١١) یازدەی پیّش زانیین دەگەڕیّتەوە بابەتەکەشی باسی فروّشتنی نیوەی پارچە زەوی‌یەکی کشت‌وکالّی دەکات . کە خاوەنەکەی ناوی پّستیك کوری توّرینەو بەمەیوانیّکی بە (٥٥) درهەمی یونانی فروّشتووە و ئەم تیّکستەم وەرگیّراوەتە سەرزمانی عەرەبی‌و لە ژمارە (١٠)ی کاروان دا بلاّوکراوەتەوە . منیش دەربارەی دوو بروانامەکەی دی لیّکوّلّینەوەیەکی لە گوّڤاری لیّکولّینەوەکانی هللینی ژمارە ٣٥ لەسالّی ١٩٥ لاپەرە ٢٢ – ٦٥ دا بلاّو کردوّتەوە . و لە نووسینە یونانیّکەی کوّلّیوەتەوەو ئەوەی یەکەمیش بوّکاولی ناردووە . کە ئەویش لیّکوّلّینەوەیەکی گوّڤاری کوّمەلّەی ئاسیّوی بریتانی لە سالّی ١٩١٩ دا بلاّو کردوتەوە . هەروا دەستخەتیّکی دیش لە ناوچەی ئاغجەلەر دوّزراوەتەوەو بە ریّنوسی ئارامی نوسراوەتەوەو و بوّ هەمان قوّناخ دەگەڕیّتەوە . ئەم دەسنووسانە گرنگترین بەنگەی میّژوویین بوّ کورد و بە گەنجینەیەکی گورج‌وگوّلاّنە لیّ بکوّلّدریّتەوە خوّشم ئەم نیازەم هەیە .

لە کوّتایی‌دا دەتوانم بلّیّم ئەوەی باسم کرد بەشیّکی زوّر کەمە لە کیّشەی کوردو لوّژی کوردی . کە بوّ روّژنامەگەریو روّشنبیری کوردی لە پلەی یەکەم دا گرنگەو لەویش گرنگتر ریّبازی لیّکوّلّینەوەی ئەم کیّشەیەیە . کە لەم کوّبوونەوەی‌دا هاوباشی تیّدا دەکەم . زور سوپاستان دەکەم بوّ گوی‌گرتن لەو بیرورا کورتانەی پیّشکیّشم کردن .

# ناو
# و
# نازناوو ناوو ناتۆرەو
# ناودەرکردن
# و
# ساناکردنی ناو
# لە ناو زمانو لە لای گەلی ئێمەدا



محمود زامدار .

## کورتە پێشەکی‌یەك

• لیٚ‌تۆژینەوەی وردو لە بارو زانستیانەی ، بارە مێژوویی‌و کۆمەلاٚیەتی‌و رۆشنبیری‌و زمانەوانی‌ی‌یەکانی هەر نەتەوەیەك کارێکی یەجگار گرینگ‌و بایەخدارو مەزنە ، چ بۆ ناسینی خودو خەون‌و ئاوات‌و کەسایەتی ئەو نەتەوەیە – لە مێژووی دێرینەو هاوچەرخ‌و نوی‌ی‌دا – چ بۆ دەسنیشانکردنی رەوت‌و پاشەرۆژی ئەو نەتەوەیە . .

ئەوەی لە لای سەر لە بەری زاناو کۆمەلٚناسە ژیرەکانیشدا زانرابێت ئەوەیە کە : مەسەلەی ناوو ناولێنان‌و نازناوو ناوو ناتۆرە ، سەر بە گەلێ پێوانەی کۆمەلاٚیەتی‌و میتۆلۆژی‌و ئاینی‌و جوغرافی‌و سێکسی‌و زمانەوانییەوەیەو وەگیرەو پەیدا بوونیشیان بە گەلێ کارەسات‌و روداوو بۆنەی تایبەتی‌و سەرگوزشتەی دیاربکراوەوە بەندەوگەر بێت‌و بە وردی لی‌ی بکۆلرێتەوە ، گەلێ بابەتی بە پێزو سەیرو دەگمەن‌و دێرا کێشەری بە کەلکی ، بۆ لێکۆلینەوەی واقیعی ئابوری‌و کۆمەلاٚیەتی‌و میتافیزیکی‌و سایکۆلۆژی لە لای ئەو گەلانەدا لی‌ی ئەکەوێت‌و روون ئەبێتەوە . . لە هەمان کاتیشا پەردەی قۆناغە جیاجیاکانی ئەو ناوانە سەرەنداز ئەکاتەوە . . ئەوەی شایان بێت‌و لێرەدا پەنجەنوما بکرێت ئەوەیە کە : دەلالەتی (لەفزی)ی دەوری خۆی لە بواری بە کارهێنان‌و گونجانی لەگەلٚ واقیعی سایکۆلۆژی نەتەوەدا ئەگێرێت‌و ئەبی بە رەمزێکی رەها ، بۆ مرۆڤ‌و بۆ ئاوات‌و ئارەزوو ئەلٚهای شارستانی‌و پاشە رۆژی ئەو مرۆڤە . . بێگومان هەیکەلی گشتی رۆشنبیری‌ی‌و ژیاری‌ی‌و ئاینییش ، دەورێکی دیار لەم بوارەدا ئەنوێنی . .

• گەلی ئێمەی کوردیش ، زمانی پاراوی ئێمەیش ، ئەگەرچی هەزاران جەزرەبەی زەمانەشی دیوەو تالاٚوی گەلێ تالٚەژانیشی چەشتوە ، بەلاٚم رووی پاکی خۆی لە شارستانێتی مرۆڤایەتی سەرکێشا ، وەرنەگێڕاوەو لە قاوغەی تەنگەبەردا کروشکەی نەبەستوە ، بەلٚکو بەردەوام لە ئالٚ‌و گۆڕدا بووەو گرەوی مان‌و بوونی خۆی لە دەس زەمانە بردۆتەوە . .

تاقە ئاوڕدانەوەیەکی قۆچاخانە ، بە سەر ئەم باسەی منا ، ئەم

راستی‌یە ئاشکراترو ڕەهاتر ئەکات ، ڕاستی‌ی (دان‌و وەرگرتن)و (تێکچرژان‌و بەخشش)ی بەردەوام . . نەخوازەللا لە بواری ناولێنان‌و نازناوو ناوو ناتۆرەو سان‌کردندا ، بە پێ‌ی گراماتیکی زمان‌و چێژی شاعیرانەی خۆی‌و بە تیرو تەسەلی‌ی دیالێکتەکانی ، چی لێ ئەکات‌و چۆنی بۆ ئەڕوات . . لە هەمان کاتا ئەوەیش ساغ ئەکاتەوە کە : (کورد) نەتەوەیەو هەموو ڕەگوماک‌و بنکەو بنەمای نەتەوەیەکی سەر ڕاستی نێو ئەم ڕۆژهەلاتەی تێدایە . .

• بە ڕاستی : ناوی تایبەتی کوردی ، زۆر تەنیاو بەنگین‌و زۆریش تایبەتی‌یە بە خۆی . . هەرچەندەیش لە هۆزێکەوە بۆ هۆزێ ، لە دەستەبەندێکەوە بۆ دەستەبەندێ ، لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی‌تر لە ئەنجامی لێکدانەوەی زمانناسی‌و فەلسەفەیی‌و شێوە زمانە جوێ جوێکانەوە ئەگۆڕێت‌و جێ‌گۆڕکێ ئەکات ، بەلام هەرخودو ئادگارو خاسیەتە کوردانەکەی خۆی نادۆڕێنێ . .

بێگومان ئەم جیاییەش لە ئەنجامی پلەو پایەی سەرکەوتن‌و گۆڕران‌و گەشەسەندنی مێژوویی‌و شارستانیا ، سەری هەلداوەو بە ئەوەوە بەندە ، بۆیە ئەبێنی (ناو) لە شارستان جۆرێك‌و لە دەورو بەری گۆل‌و ڕووبارەکانا چەشنێك‌و لە پێدەشت‌و نێو شاخ‌و بنارشاخ‌و چرە دارستانەکانا بە ڕەنگێکی‌تر ، خۆی وەدەرئەخا . . هەندێ (ناو) هەیە لێکدراوەو هەندێ تاکەو هەندێ ئاینی‌و هەندێ بۆ شوێن‌و هەندێ بۆ کات‌و هەندێ بۆ هیوایەك‌و هەندێ بۆ خەوبنین‌و خۆشییەك‌و هەندێ وەکو ئاوەلناو سیفەت‌و هەندێ بۆ نزاودوعاو چاوەزار بە کاردێت .

ئەم باسەی ئێرەیش ، تا ئێستا دەستی لێ‌نەدراوەو دەقومۆری نەشکاوە . مەگەر نالێم تەنیا (ناوەکان) ئەمیش – بۆ مەبەستێکی‌تر – وزۆر بە بەر تەسکی‌یەوە لە چەند نامیلکەیەکدا کۆکرابنەوە . . بۆیە بابەتی ئەم لێکۆلینەوەیە ، هەرچەندە بە کەلکی زمانناسی دێ ، ئەوەندەیش فریای کۆمەلناس‌و فۆلکلۆریست‌و مێژوونووسە لێهاتووەکان ، ئەکەوێ . .

• مەسەلەی ناولێنان‌و نازناو و ناتۆرە هەلبژاردن لە کوردی‌و لە کوردەواری‌دا ، هەر ڕاستەو ڕاست ، سەر بە جۆری فیکرو لێکدانەوەی میللی‌و مێژوویی‌و بنەمای زمان‌و دیالێکت‌و چەشنی هەلکەوتنی قورگ‌و جیرو گیرکردنی دەم‌و دان‌و زمان‌و مەلاشووولووت‌و فونێتیکی کوردی‌یەوەیە ، کە ئەمیش بە دەوری خۆی ، گرێ‌ی چەشنێ لە چەشنەکانی ژیری‌و وریایی‌و بیرو باری سەرنج‌و لێ‌تۆژینەوەی مرۆڤی ئەم ولاتە ئەکاتەوەو هەموو نەتەوەی کوردیش ئەگرێتە خۆی . . هەر بۆیەشە ئەم جۆرە باسانە ، گەلێ لە زانایانی کۆمەل‌و سایکۆلۆژیست‌و مێژوونووس‌و زمانناس‌و فۆلکلۆریست‌و گرامەرچی‌یەکان پەنای بۆ ئەبەن‌و گەشترین ڕۆژانی تەمەنیان . لە ژوانیا بە سەر ئەبەن . .

• هەر بۆ زیاتر سەرنج ڕاکێشانیش ، ئەبێ لێرەدا پەنجە بۆ تۆتەمیزم (ToTem) ڕابکێشرێت ، کە کوردی ئێمە ، ئەم قۆناغ‌و تۆتەمیزمەی زانیوەو بەم قۆناغەدا ڕەت‌بووە ، هەر وەك چۆن لە نێو ناوو نازناوەکانی ئەم باسەدا خۆی نواندوە .

تۆتەمیزم – الطوطمیة – لە بنجا بۆ خێلە کەودەنەکانی ڕۆژهەلات‌و ڕۆژئاوا بە کارهاتووەو زاراوەیەکی هیندی‌یە سوورەکانی ئەمەریکای باکوورە . . دروشمێکە بۆ بنەمالەیەك ، یا بۆ خێلێکی کەودەن‌و پەتیارەی سەر بە دایك‌و ناوی خۆیان بەو دروشمەوە ناوزەد دەکەن . . وا ئەبێ ئەو دروشمە ، زیندەوەرێ ، یا ئاژەلێ بێت ، یا بالندەو فرندەو ڕووەکێك ، یا درەخت‌و بەردێك وقسنێك . . . وایش ئەبێ ئەو دروشمە ، بە پەیکەرێك یا بەنەقش‌و نیگاری پلەبەردێ یا سماتە بەردێ بنوێنرێت ، یا بە نیگارێکی ڕەنگاو ڕەنگی سەر تەختەدارو پاتال‌و شوشە بەندێك ڕەنگ بڕێژرێت . . وا ئەبێ ئەو دروشمانە یا بە (خوا) و یا بە (نیمچەخوا) بناسرێت ، بەلام خواییەکەو هێزی خولقاندن‌و داهێنانی کەمەو دەسەلاتی بە سەر ئادەمیزادا ناشکێت ، بەلکو دروشمێکە وەك (چاوەزار) بە کار ئەهێنرێت ، خۆگەر هات‌و لە شەڕو مەرگەسات‌و نەخۆشی نەیپاراستن ، ئەوا یا ئەیکوژن یا ئەیشکێنن‌و یا ئەیخۆن‌و یانیش پشت گوێ‌ی ئەخەن‌و لێ‌ی لا تەریك ئەبن . . بە مەیش (تۆتەمیزم) ئەبێ بە نموونەی کۆمەلگەیەکی بچووکی تیرە یا خێل . . !

• ئەمە لە سوچێك‌و لە سەر سوچێکی‌ترەوە ، ئاینەکان‌و بە تایبەتی ئاینی موسلمانەتی ، هۆیەکی هەرە بە هێز بووە بۆ بلاوکردنەوەی زمانی بەرگوشادی عەرەبی ، لەنێو میللەتە موسلمانەکانی غەیرەز عەرەب ، هەر لە گینیاو ئەرتیریاوە بگرە ، تا دەگەیتە عەجەمستان‌و گورجستان‌و تاژبکستان‌و هەموو ئەو شوێنانەی کە ئیسلامەتی ڕووی تی‌کردبێت‌و ڕەگاژۆبووبێت ، بە کارهێنراوە . . بەلام گەلێ لەو کەرەستەو ناوو زاراوو وشە عەرەبیانە – بە تایبەتی ناوەکان – بە پێ‌ی زەوقی زمان‌و گرامەری ئەو میللەتانە گۆڕراون‌و تێك شکاون . . . ! ئەمەو سەرباری کارتێکردنی فیکری میترایی‌و بوزی‌و زەردەشتی‌و تەورات‌و ئینجیل ، بە سەر واقیعی کۆمەلایەتی‌و میتافیزیکی ئەو گەلانە ، کە نەتەوەی کوردیش دانەیەکەلەو زنجیرەیە . . سەرەڕای ئەم دیاردە ئاینی‌یەش . . گەلەکان . لە نێو

خۆیانیش دا کاریان لە یەکتری کردوەو لەم بوارەدا ئاڵوگۆڕێکی زۆرو بە گەڵێ چەشن کراوە .

* لە ئەنجاما : من ئەزانم ئەم باسەی من ، ئەوەندە قووڵ نیەو پێویستیەکی زۆری بە پشکنین‌و دانیشتن‌و گەڕان‌و سوڕان هەیەو ئەوەیش نیە تا زۆر خۆمی پێوە رانیم ، بۆیە چاوەنوارم ئێوەی شارەزا ، لە بارتری بکەن ، تا ئەمەی منیش بێ بە بەشێ ، بە زنجیرەێ ، لە زنجیرەکانی لێکۆڵینەوەی زمان‌و مێژوو کۆمەڵی کوردستانی راچەنیو . . . !

## بە شێوەیەکی تایبەتی

لە شارستان

١ – ناوی ئاینی

أ – ئەو ناوانەی بە پاشگری (الله)وە دوایان دێ ، وەك : (نعمة الله – عبدالله – عطاالله – رحمة الله – عبیدالله . . .)

ب – ئەوانەی ناوەکانی تری ( خوا ) یان هەڵگرتووە ، وەکو : (عبدالستار – عبدالغفور – عبدالحمید – عبدالحمید – عبدالوهاب –عبدالجبار – عبدالخالق – عبد المؤمن – عبدالرحمن . . .)

جـ – ئەو ناوانەی کە ناوی پێغەمبەرانیان بە بالاّ براوە . وەکو : (محمد – احمد – ابراهیم – یوسف – زکریا – خضر – الیاس – صالح – عوزێر – داوود – موسا – سلیمان – عیسا – ادریس – یونس – ذوالنون . . .)

د – ئەو ناوانەی کە بە وشەو پاشگری (الدین) پایە دۆست ئەبێ ، وەکو :

(بهاء الدین – عزالدین – صلاح الدین – علاء الدین – شمس الدین – جمال الدین . . .)

٢ – ناوی مێژوویی

أ – ناوە عەرەبیەکان وەکو :

(ابو بکر – عمر – حسین – خالد – حیدر – علی – عثمان – حسن – عباس – حمزة – مطلب – . . . .)

ب – ناوە ئێرانی‌و کوردیەکان ، وەکو :

(ئردە شێر – ئەسفەندیار – ئەفراسیاب – بەهمەن – مەزدە – فەرزەند – بەنگین – گیو – ئارش – چەکۆو – خەسرەو – ڕۆستەم – جەمشید – لەپ‌زێڕین – سیامەند – فەرهاد – سمکۆ – پێشەوا . . .)

ج – تورکە عوسمانلیەکان گەڵێ لە ناوە عەرەبیەکانیان وەرگرتووە ، با عەرەبیش بە کاری نەهێنا بێ ، بە پێی چێژو خاسیەتی زمانەکەی خۆیان ، گۆڕیویانەو ئێمەیش – لە کۆن‌و ئێستاماندا – لە ئەوانەوە ئەم دیاردەیەمان بۆ ماوەتەوە ، وەکو :

١ – (حکمت – رأفت – رفعت – عزت – هیدایت – بهجت – شوکت – نعمت . .)

بۆ نێرینەو چەل‌ناچەلێکیش بۆ مێینە بە کارهاتووە .

٢ – (سعاد – سداد – وداد – نهاد – فؤاد . . .) بۆ مێینەو چەل نا چەلێکیش بۆ نێرینە بە کارهاتووە .

د – هەر لە سەر هەمان ڕێڕەو ، هەندێ ناوی کەی بە نەژاد عەرەبی ، تورکەکان وەریان گرتووەو بە گوێرەی چێژی کۆمەلاّیەتی‌و زمانەوانی خۆیان ، چ وەکو (ناو) چ‌وەکو (نازناو) بەکاریان هێناوە ، کوردەکەش – لە ئەنجامی گەڵێ هۆی دیاری شارستانی‌و کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی‌یەوە – لاسایی ئەمانی کردوەو بە کاری هێناون وەکو : ( حقی – زهدی – رشدی – فهمی – حلمی – عونی – زکی – شوقی – وصفی – فوزی – رمزی – رفقی . .تاد) بەلاّم ئەبێ ئەوە لەبەر چاوبێ کە ئەم (یّ)یەبە هیچ جۆرێ بۆ نیسبەت‌و دانە پاڵ نیە هەروا ئەمانە زۆر جار ئەبن بەنازناووئە کەونە پێش ناوی وەك : (محمد – اسماعیل – ....) .

هـ – لە کوردستانا – بە تایباتی لە چاخی عوسمانلی‌و سەفەوی‌و قاجاریاندا – لە لایەن شاو سوڵتانەوە گەڵێ نازناو بە کوردە دەسەلاّتدارەکان دراوە ، وەکو :

(چەلەبی – نقیب – خان – پاشا – شازادە – بەگ – ئاغا – سان – پساغا – میر – میری میران – میرزا میرزادە – پس میر[1]) ولەتەك ناوەکانا بە کارهاتوون ، یا کوردەکە خۆی بۆی داتاشیوە ، یا لە (نازناو)ەوە کردویەتی بە ناوو بەکاری هێناوە .

٣ – ناوی نوێ

أ – ناوی عەرەبی (بۆ نێرینەو مێینە) وەکو : (ابتسام – نجاح – سمیرة – حربة – أمل – نوال – لائقة – خالدة – رائدة – عایدة – لیلی – جمیلە – شادیە – سامیە – سهام – طارق – عاصم – ناصر– سلام – وسام – فائز –)

ب – ناوی کوردی (بۆ مێینەو نێرینە) وەکو :

(جوان – ئاواز – هەلاّڵە – پەخشان – نازدار – نازەنین – شیرین – بەفرین – بەختیار – دڵدار – ئاسۆ – ڤیان – زانا – پشکۆ – بەهرە – شۆخمیر – مزگێن – هاریڤان – دلڤین – زێرەڤان – دڵبرین – دلگەش – گولستان – جوانمێر – هونەر – هیوا – شنە – ناهید[2])

ج – ناوی ئاوروپایی‌و جیهانی (بۆ نیرینەو مێینە) وەکو :

(سۆزان – سیڤەر – تۆفیا – گیڤارا – کاسترۆ – بریجیت – بۆدلێر – نەهرۆ – کامۆ – ئەنجیلا – غاندی – زوربا . . .)

له دێهات

١ – وشەو ناوی رەقو دری گیانلەبەر ، بۆترس و سامو دوژمن تۆقاندن وەکو : (شێرکۆ – گورگۆ – جرجۆ – هرچۆ – پڵنگۆ – کتکۆ . . .)

٢ – هەندی وشەو ناولێنانی وا هەیە کە هەندێکی مانادارەو هەندێکی هیچ واتایەکی نیە ، بەڵام خۆی لە خۆی‌دا ، نیشانەیەکە بۆ شتی سەیرو پیس و لەو تاوو بۆ ناوو ناتۆرە بەکارئەهێنرێ وەکو : (پزێ – کتۆ – بیبۆ – هۆیۆ – حوچۆ – کەمۆ – پەچۆ – خەپێ – قنۆ – قلقۆ – رۆرۆ – ترحۆ . . .)

٣ – وا ئەبێ ، هیچ بایەخێکی ئەوتۆ بە ناو نادەن و زۆر جار – وا ئەبێ – منالێ تا منالە ، بە ناوێ بانگی ئەکەن ، کە گەورە بوو ، بە ناوێکی تر ناوی دەبەن . . کە منالە بە (بابە – کاکە – دایە – بەرخۆ – چاوێ – خرپۆ . . .)

کە گەورەش بوو ، خەتی سمێلی دانا ، یا مەمکی گۆی کرد ، لە پرێکا بە (عەلۆ – عەلەکە – حەسۆ – کالێ – زارێ – محێ . . .) ناوزەدی دەکەن .

٤ – هەندێ ناو هەیە بە هۆی بۆنە کۆمەلایەتیەکانەوە سەرهەڵئەدا ، هەر بۆ نموونە لە کاتی کەمالیەکاندا ناوی (حریت – عدالت – مساوات) زۆر باوبوو ، هەروا گەر کابرایەکی کاربەدەست بێتە ناوچەیەك لە ناوچەکانی کوردستانەوە ، وردە وردە ناوەکەی وا باوو بلاو ئەبێ ، زۆر کەس لە خەڵکە سادەکە ، ناوی منالەکانیان بە ناوی ئەوەوە ، ناو ئەنێن ، جا با ئەو کابرایە ناوەکەیشی کوردی نەبێ ، ئەمەیان بە لاوە گرینگ نیە هەروا بۆنەو کارەساتی جگەربڕ ، گەلێ جار ئەبێتە مایەی پەیدابوونی جۆرە ناوێك . جا ئەو ناوە چ بۆ بەرگەگرتن بێت ، یا مانای هەناسە ساردی و یادی ناخۆش بخاتەوە بیر ، وەك : (ئەژین – ڤەهێل – نیوار – چەتۆ – ژیمان – سەرکەوت – وارهێل – مژوار – . . .تاد)

٥ – هەندێ ناو یا نازناو هەیە ، بە هۆی بۆنە مێژوویی و سیاسیەکانەوە بلاوئەبێتەوە ، وەکو (جەنگی) لە کاتی شەڕو ئاشوب و هەرادا ، ئاوایش ناوو نازناوی (شۆرش – حربی – ئادار – پێشەوا – پیران – جەنگاوەر – غاندی – ماشێن – زرێ – ساروخ . . .)

٦ – هەندێ ناو هەیە ، بۆنە ئاینی‌یەکان بە دەستاوێژێکی کەی ناولێنان لە دێهات و هەروا لە شارستانی کوردستاندا دورستی ئەکات ، وەکو :

(رەمەزان – حاجی – جمعة – محرم – شعبان – عیدۆ – هەینی – جەژنی – رجەب – . . .)

٧ – هەندێ ناوی وا هەیە ، کە تەنیا رێککەوت دورستی ئەکات . . گریمان وا ئەبێ کابرایەك لە کاتی ژان وژووری ژن و منال بووندا ، ژنەکەی منالێکی ئەبێ – کوڕ بێ یا کچ – لەو دەمەدا چاوی بە هەرچی و گوێی لە هەر چی‌بێ ، بەو ناوە ناوزەدی ئەکا . لە دوایی‌دا ، ئەشێ بیگۆڕێ – بەڵام ئەم دیاردەیە زۆر کەمە – وەکو :

(ژورژوو – ئاسکە – تەپاڵە – پشقلێ – چنار – دۆشاو . . .)

٨ – هەندێ ناوی وا هەیە ، بە ناوی ئەستێرەکانە ناو ئەنرێن . وەکو زوربەی میللەتە کۆنینەو سەرەتاییەکان : وەکو :

(مەهۆ – ئەستێرە – پێروو – ئەختەر – ئافتاو – پەروین – هەتاو – رۆژە – گەلاوێژ . . .)

٩ – هەندێ ناو هەیە – بۆ کوڕو کچ – تایبەتی‌یە بە ئێزیدی‌یە کوردەکان وەك (گوهدار – کەڤێ – مشکۆ – عیدۆ – کرێت – شارێ – پێلێ – شورێ – سیتو – قرباڵ – پیرگرو – شەمۆ – بەلۆ – فەلیت – مەنجۆل – گۆزێ – شەمێ – شۆرۆ –تاد . . .)

## به شێوەیەکی گشتی

ناولێنیان لە زمانی کوردی‌دا

١ – ناوی عەرەبی و فارسی و تورکی و عیبری ، وەکو : (محمود – فەرەیدون – ئۆغز – نوح – ابراهیم – اصلان – ارسلان – نزار – علی – بەهمەن – میکایل . . .)

٢ – ئەو ناوانەی کە سیفەتێ ئەگرنە خۆ ، کە بە تێکرایی سیفەت و خاسیەتی باشن ، بەڵام لە چەند سیفەتێکی تری (سلبی) بە دەرنین و بێ مەبەستیش نین ، وەکو :

لاو چاك – سوارە – چەڵەنگ – هۆشەنگ – دلێر – پێشرەو . . .)

٣ – هەندی نازناوو ناوی وا هەیە ، واتای خراپەکاری و چاوسوورکردنەوە ئەداتە دەست ، بەڵام چاوسوورکردنەوەیەك لەگەڵ دوژمن و بۆ دوژمن ، هەر دوژمنێ بێت ، وەکو :

(دلڕەق – درێ – پەتیارە – کەودەن – دڕندە . . .)

٤ – ناوی ئاژەڵ و گیانلەبەر ، وەکو :

مامر – مشکۆ – شێرە – سیخوڕ – گیسکە – بەراز – ئاسکە

- قومری - سوێسکە - پەرەسێلکە - شاهۆ - هەڵۆ - کەوێ - بازێ - شاهین - سمۆرە . . .تاد) هەروا گەلێ جاریش وەك نازناوێ بەکار ئەهێنرێ .

٥ - ناوی گوڵو گژو گیاو روەك - ئەمەیان پتر بۆ کچ بەکاردێ - وەکو :

(هەرمێ - نێرگز - رەزێ - سەرگوڵێ - شەمامە - مێخك - چرۆ - هێرۆ - وەنەوشە - گوڵێ - گێلاس - گەزیزە - شلێر - هێشوو - گوڵان - گوڵچین - گوڵناز - شیلان - رێواس - نەمام - بەهێ - خەرامان - بەرەزا - چنار - خۆخێ - ژاڵە - چنوور - سێوێ . . .تاد)

٦ - ناوی کات : وەکو :

(هەینی - ساڵۆ - بەیان - سپیدە - خەزان - رۆژێ - نەورۆز - شەوێ - بەهار - رۆژگار - زفستان . . .)

٧ - ناوی جێگا : وەکو :

(ئاسۆس - ئەزمەر - بێستوون - هەڵگورد - بۆتان - ئەردەلان - چیا - دەرسیم - زۆزك - سیروان - زاگرۆس - سەفین - نیشتمان - مەریوان - هەندرێن - سیپان - سەیوان - هەورامان - ئەرارات - بێخاڵ - کوردستان - مەهاباد[٣])

٨ - نازناوو خێڵو خانەوادەو بەرەبابو ناوچەو کۆلانو رەگەز ، وەکو :

(دۆسکی - زێباری - شێروانی - جاف - مزوری - شوان - مەنگوری - هەمەوەندی - هەکاری- کانێسکانی - جزیری - بادینانی - شاربازێری - کەرکووکی - شارەزووری - شۆڕبجەیی - گرگاشی - بندیان - بابان - شاکەلی - دێلێژەیی - دیاربەکری - ئامێدی - خانەقینی - موکریانی - هەمدانی - ساڵەیی - حەیدەری - ئاکرەیی - حاجی نەبی - جەلیزادە - بەدرخانی - گەڕاوی - قزلجەیی - کۆکۆیی - کلاوقووت - بۆسکانی[٤]) .

٩ - نازناوو ناوی رەگەزی بانی ئێرانی ، وەکو :

(دارا - ئەفراسیاب - رۆستەم - گورگین - گۆدرز - زۆراب - ئەردەشێر - نەوشیرەوان - ئەسفەندیار . . .)

١٠ - نازناوو ناوی سەر بە پیشەو کار ، وەکو :

(شوفێر - خەزنەدار - چاوەش - بێریڤان - کلاشکە - کلاشچن - باشبۆزغ - دەهۆلکوت - زورناژەن - ئاشەڤان - ئاسنگەر - جوتیار - عەلەمدار - باغەوان - سەوزەفرۆش - کرێکار - وەرزێر - قەزوانفرۆش - سەبزەچی . . .) .

١١ - نازناوو ناوی سووكو چرووكو هیچو پووچ ، وەکو :

(کوێرە - کەرێ - کەچەڵ - قەموور - گوێبراو - خێلە - حەپۆل - شوغال - گەمشۆ - گولە - گەڕە - پنچك - قەشمەری - چەوەندەر - تۆڵەکە - دەعۆ - نابووت - شێلم - گەلحۆ - مارمیلۆك . . .)

١٢ - ناوی نوێی عەرەبیو کوردیو ئاوروپایی :

(سۆزان - سعاد - سیزان - ماجدة - اشواق - ازهار - مارلین - شەونم - نەسرین - گولاڵە - بەفرین - ئاشتی - پاکی - راستی . . .)

١٣ - ناوی کۆنی پیاوو ژن (رەسەنو کوردی) :

(زارێ - خانەگوڵ - مینا - بەگیسی - بەهزاد - مەنیژە - دڵبەر - ئەستی - باوەیس - چەتۆ - خودادادا - جیهانبەخش - گەزۆ - وەیسی - پیربال - پیرۆت - خوادە - خورشید - بایز - فریاد - پیرۆز - شاناز - رەعنا - کلاوزەر - بێژەن - لەعلی - زێرین - پەریخان - گوڵیزار - پەریزاد - چراخان - حەلاو - بەسێ - تەمەر - خانێ - تێلی - لەعلیخان - هەسەم - سیابەند - کاکەمەم - خاتوزین - گوڵخەندان - گوندێ - خانزاد - گوڵناز . . .)

١٤ - نازناوو ناوی سروشت ، وەکو : (کەپکێ - یالێ - ملە - گەردن - بەردێ - دۆڵێ - روبار - جەنگەڵ - بۆران[٥]) .

١٥ - ناوی ئەوشتانەی کە مرۆڤی کورد بەکاری ئەهێنیو لە لایدا جۆرە نرخێکی هەیە وەکو :

(داسولکە - قەلانگ - خەنجەر - قەیناغ - بفر - مەنجەڵ - تفەنگ - شمشێر - کەوان - کوتەك . . .)

١٦ - ناوی رەنگو سیفەتی ئەندامو لەش ، وەکو : (رەشۆ - کاڵێ - بۆرێ - بۆزێ - سورێ - مۆرێ - چاوبەلەك - شینە - زەردێ - سەوزە - سوورەگوڵ - گوڵەندام - چاوکاڵ - چاوشین - ئەسمەرێ . . .)

١٧ - ناوی مەعنەویو سایکۆلۆژی ، وەکو :

(کسپە - ئارام - هەدار - چریە - شاپەری - بلیمەت - راز - سۆزێ - پەری - ئارەزوو - ئامانج - نەمر - بەرزی - یار - سایە - ناز - کلپە - راستی - تەنیا - مژدە - نەنگۆ - زیندوو - هیوا - ئۆخەی - بەستە - بەهەشت . . .)

١٨ - ئەو ناوانەی کە لە سیفەتەوە سەرهەڵئەدەن ، وەکو :

شەرمین : لە شەرمەوە

بەفرین : لە بەفرەوە

خوناو : لە ئاونگەوە

شۆڕێ : لە شلو ملیەوە
لەنجە : لە نازو لارەوە
ناسکێ : لە شەنگیەوە . . .
١٩ – ناوی روناکیو ئەستێرەکان ، وەکو
(مانگێ – ئەستێرە – پرشنگ – ئەختەر – پەروین – خۆرەتاو – رۆژبەیان – گوڵەبەرۆژە – ئافتاو – هەیڤێ – پێروو – گەلاوێژ . . .)
٢٠ – ناوی بە هێزو وشکو در (بۆ ترساندنو رێزلێگرتن) وەکو : (ئەژدیها – نەهەنگ – بڵند – باهۆ – پاڵەوان – نۆتەغار – تۆلاز – جوامێر – جەنگاوەر – رەشکۆ – سەرۆك – شێرکوژ – قارەمان – هێرش – شێردڵ – وەشتی – هەڵۆ – هەڵدێر – ئەژی – سالار – قەڵغان – سەردار – رەشمار – کەندوبڕ – سەرەخۆرە – دۆبڕ – فسۆس . . .)
٢١ – ناوو نازناوی رێبازو تەریقەت ، وەکو :
(عەلوی – وسووبی – پیرشالیاری – نەقشبەندی – ئەحەبی – ئێزیدی – کۆنەپۆشی – محیّبی – حەمە سوری – حوسەبی – داسنی – مەولوودی – مەولەوی – رفاعی – قالەبی – مامەرەزابی – وەسمانی – زەردەشتی – قادری . . .)
٢٢ – نازناوو ناوی سێکس (بۆ سیفەتو جوێنو تانەو تەشەر) وەکو :
(قوزێ – کیرۆ – گونێ – قۆرێ – حیزە – قوزباتمان – قوونەدەستار – کوزدەر – گاندەر – چاوحیز – . . . .)
٢٣ – زۆرجار ، یا لەبەر نەزانی ، یا لەبەر زێدە خۆشویستن ، سیفەت ئەکەوێتە بەر ناوو ئەبێ بە ناوێکی سەربەخۆ ، وەکو :
(نبی محمد – خلیل ابراهیم . . .)
٢٤ – هەندێ جار ، ماڵێ هەیە ، دوو کچ ، یا دوو ژنی تێدایە (یەك) ناوییان هەیە ، یەکیان (ئامە) ئەوەی کە (هەمین) یەکەم (خەجێ) دووەمین (خەجیج) . . !
٢٥ – گەلێ جار گەر بەردەوام ژنێك منالی نەوەستێو بمرێو بۆ ئەوەی منالی تازەبووی بمێنیو بژێ ، ناوی سەیرسەیری لێ دەنێن وەك : (ئەڵمان – عەتەم – تاد)
٢٦ – گەلێ جار بۆ گەلێ مەبەست ناوی نهێنی بۆ منال بەکار ئەهێنرێت ، کە چی منالەکە ناوێکیتری ئاشکرای هەیە .
٢٧ – وا ئەبێ ژنێك منالی نابێ یا راناوەستێ یا بۆ مەبەستی تەمەندرێژی ، دەچێتە لای شێخ یا مەلا یا سەر پیاو چاکێكو نەزردەگرێو بە ناوی ئەوەوە یا بە هەڵبژاردنی ئەوەوە منالەکە ناو ئەنرێت .
٢٨ – وا ئەبێ کابرایەك چ لە هەرزەیی و چ لە باوکایەتیدا حەز لە یەکێ دەکاو بۆی نالوێو نابێ ، کە ژنەکەی منالی ئەبێ ناوی کچەکەی – گەر کچ بوو – بە ناوی کۆنە دڵخوازەکەی ناوزەد ئەکا . . . دوور نیە ژنەکەشی ئەمە بکا – گەر بۆی بلوێ – .
٢٩ – گەلێ جار وا ئەبێ ، پیاو یا ژن ، خەون ئەبینین – هەر جۆرە خەونێ – وهەر لەو خەونەدا ناو بۆ مندالەکانیان دائەنێن .
٣٠ – گەر بێتو ژنێك مندالی راناوەستێو بمرێو بۆ چاوەزار دێن ناوێکی گاورانی لێدەنێن . . !
٣١ – لە ژێر سێبەری رەشوقەتمەری دەرەبەگایەتیدا ، ئەوانەی کە سەر بە (ئاغا)نو مالی ئاغان ، ناو یا نازناوی تایبەتی خۆیان هەیەو پێی بانگ دەکرێنو دەناسرێن ، وەکو :
(سەرکار – دز – ناومالێ – پاکار – شەقڵچی – کوێخا – میرزا – کارەکەر – نۆبەتدار – سەیس – قاوەچی – گزیر – سەپان – نیشانشکێن – پاسەوان . . .)
٣٢ – لە کوردەواریدا ، ناوی (مەلا) دەورێکی گرینگی هەیەو بۆ رێزلێنانو گەورەیی بەکاردێ ، ئینجا (شێخ) و (پیر) و (باوە) و (سەید) . .
ناوی نەوەکانیشیان بە :
(باوەیادگار)و (پیرەسوور)و (مەلازادە) و (شێخ زادە) و (سەییدزادە) ناو ئەبرێن . . هەروا بۆ رێزگرتن (مامۆستا) و (کامەلا) و (یا شێخ) و (مام سەید)و (پیر داود) و (کاسەید)و (کاکە شێخ) بەکار ئەهێنرێ . . .
٣٣ – لە پالێ ناوی تایبەتی ژنا ، لە کوردەواریدا بۆ رێزگرتنو میهرو سۆزو خۆشەویستیو مەزنیی (پێشبەند)ێك یا ( پاشبەند)ێك ئەنێنە ناوەکەوەو بانگی ئەکەن ، یا هەر ئەم پاشبەندو پێشبەندانە – بیلامانێ – ئەبن بە ناوی راستەو خۆی ژنەکە ، وەکو :
(خان – خاتوون – خانم – یانی – یایە – دایکێ – دا – پلە – باجی – نەنێ – داپیرە – دادە – تاتێ – میمی – ژنخالێ – ژنمام – ژنبرا – کچخالێ – دۆتمام – ئامۆژن – خالۆژن – براژن . . .)
٣٤ – هەروا هەمان دیاردە ، بۆ پیاو وبۆ هەمان مەبەستیش بەکاردێ ، وەکو :
(کاك – کاکێ – ئەزبەنی – رۆڵەی مامێ – برالە – باپیرە – مامە – سەیدا – ئەزخولام – خالۆزا – قوربان – گەورەم – کاکیبرا – ئەفەندی – مامۆستا . . .)
٣٥ – هەر لەکۆنەوە ، ئێستاش کە ئێستایە ، هەندێ لە ئەدیبو شاعیرو نووسەرانی کورد ، وازیان لە نازناوی خێڵو ناوچەو رەگەزو پیشەو بەرەباب هێناوەو لەبەر هەر تەئسیرێك بووبێ – گشتیو تایبەتی

– روویان کردۆتە جۆرە نازناوێکی‌ترو ناوی (خۆیی – زاتی) یان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە ، وەکو :
(نالی – کوردی – مەولەوی – کەیفی – قوبادی – حەریق – مەحوی – پیرەمێرد – بێکەس – دڵدار – کامەران . . .)
کەچی ئەوەی جیٚی سەر سورمانە ، ئەم چەشنە ناوانە ، لەنێو ئەدیب‌و شاعیرانی کورد ، بە شێوەیەکی سەیرو زۆریش تایبەتی لە شاری (هەولێرو) دەوروبەری‌دا تەشەنەی‌کردوە ، وەکو :
(زامدار – هێمن – شێواو – پەرۆش – پەشێو – سەرسام – خەمناك – شەورۆ – هەژار – ئاوارە – ژاکاو – بیٚبەش – برژاو – بێگەرد – هەڵمەت – شارەزا – سووتاو – خەمگین – رەنجبەر – بێنەوا – شۆرش – رەنجوور – رەنجەرۆ – بێخەو هێرش – تاساو – پەریشان . . .)
٣٦ – وا ئەبیٚ ژن لە ولاٚتی غەریبایەتی‌دا ، یا لە شوێنێکی ناودارا ، ژان ئەیگریٚ‌و منالٚی ئەبیٚ ، ناوی منالٚەکە –کوربیٚ یا کچ – بە ناوی ئەو ولاٚت‌و شوێنە ناوئەنریٚ .
وەك : (تورکیا – شنۆ – سوریا – سەردەشت – سەرچنار – بێخالٚ . . .تاد)
٣٧ – هەندیٚ ناوی منالٚ هەیە بە ناوی گۆرانیبیژو شاعیرو مەلاو شێخان ناو ئەنریٚ .
٣٨ – هەندیٚ ناوی منالٚ هەیە ، بە ناوی میوانەوە ناو ئەنریٚ ، گەر لە کاتی ئەو میوانداریەدا ژنی مالٚ ژانی گرت‌و منالٚی بوو .
٣٩ – منالٚ هەیە –کور یا کچ – ناوی تایبەتی خۆی هەیە ، لە هەمان کاتیشا ، جا بۆ چ مەبەستێك بێت ناوی نهێنیشی هەیە .
٤٠ – لە تەك ئەو خاسیەتەی کە زمان‌و کۆمەڵی ئیٚمە لە بنیادنانی (ناو)دا هەیەتی – وەك باسکرا – بەلاٚم بە زۆری ، کورد حەز لەو ناوانە دەکا کە بە (وان) و (مان)و (ان) کۆتاییان دیٚ . لەم رەسەنایەتی‌یەشدا ، لە تەك گەلی لە میللەتانی هیندوئیرانی و ئەوروپی یەك ئەگرێتەوە ، وەکو :
(پالٚەوان – مەلەوان – باغەوان – چاوان – شوان – گاوان – کاروان – شاخەوان – قارەمان – پەریخان – خەرامان – پەخشان – گوڵخەندان . . .)

**سەرنج :**

تا ئیٚستا ئەو (٤٠) خالاٚنەمان باس کرد ، گەر بە وردی لە هەر یەکیٚ لەم دیاردانە بکۆلرێتەوە ، بیٚگومان ئەبێتە مایەی رەنگرشتنی گەلی باس‌و بابەتی وردو لە بارو (قوناغێك – روداوێك – دیاردەیەك) کیش نیشان‌ئەدات .

## ناوو ناتۆرەو بچووك‌و ساناکردنی ناو لە کوردی‌دا

ناو بچووك‌کردن لە کوردی‌دا – ناوی بێگانەو خۆمالٚی – هەر یەکجار باوەو دەروازەیەکی سەراوەڵەی هەیەو هەر لە کۆنی کۆنەوە ، کوردەکە خۆی بە شێوازو رێبازی تایەتی‌و بە پیٚی گرامەری زمان‌و هەڵکەوتنی قورگ‌و مەلاٚشوو ددان‌و لێوو فونێتیکەکەی بۆ رسکاندوە ، سەرباری چێژو زەوق جوانکارانەی نەتەوەو زمانەکەی . . ئەمیش لە ریٚی ئامرازی (ۆك) کە بۆ تانەو ریسواکردن‌و (ۆکە) کە بۆ خۆشەویستی‌و میهرەو جار ناجاریش بۆ تەوسە . . (ئەکە)و (ککە) بۆ پتر ناسك‌کردن‌و جوانی . . (یٚ)یش بۆ زیٚدە زیٚدە خۆشەویستی . .
ناوی بچووك کراو ، لەم زمانە شیرینەدا ، وا تیٚك ئەشکێنریٚ‌و چەرخ ئەدریٚ‌و شیرین‌و پوخت‌ئەکریٚ – لام وایە – دەگمەنە زۆر ، ئەم دیاردەیە ، بەم شێوە شیرینەی لە زمانێکی‌تردا ، وا چرۆی دەرکردبیٚ‌و گوڵی دابیٚ . .

١ – ناوی ژن ، وەکو :
بهیە = بەهیٚ . بەهە . بەهۆك
حبیبة . حربیە = حەبیٚ . حەبۆ . حەبە . حەربۆ . حەربۆك
رابعە = رابە . رابی . رابۆ . رابۆك
زهرة = زەهیٚ . زەهۆ .زەهە .زەهۆك
کافیە = کافیٚ . کەفۆ . کافە . کەفۆك
آمنە . = ئامە . ئامۆ . ئامیٚ . هەمە . هەمین . ئامۆك
فاطمە = فاتم . فاتە . فاتیٚ . فاتۆ . فیتیٚ . فەتۆك
خدیجە = خەجە . خەجۆ . خەجیٚ . خەجیج . خەدیج . خەجۆك
عائشە = ئایشە . ئایشۆ . ئایشیٚ . ئایشۆك
رمزیە = رەمە . رەمۆ . رەمۆك
زینب = زەنە . زەنۆ . زەینۆ . زەینۆك – زەینەبۆك
مریم = مرە . مرۆ . مەرە . مەرۆ . مەرۆك . . .
وسیلة = وەسە . وەسیٚ . وەسۆ . وەسۆك

٢ – ناوی پیاو ، وەکو :
محمد = حەمە . مەمەد . مەمۆ . مەمەند . مەم . حەمەدۆك . مەمەدۆك
احمد = ئەحە . ئەحمەد .حەمۆ . ئەحمیٚ . ئەحمۆ . ئەحۆك
حسین = حسە . حوسە .حسۆ . حسۆك
عمر = ئۆمەر . عەمیٚ . عەمۆ . هۆمەر . هۆمەرۆك
عثمان = وەسمان . ئۆسۆ . ئۆسیٚ . وەسمانۆك
عبدالرحمن = ئەورەحمان . دەحیٚ . دەحۆ . دەحۆك . رەحمانۆ
محمود = مەحمو . مەحمويد . مەحمی . مەحموی . مەحۆلە

مەحمودۆك

قادر = قایر . قاله . قادۆ . قەدۆ .قەدۆك .قادرۆك .

فتاح = فەتە . فەتەح . فەتۆ . پەتە . فەتۆك

جمیل - جمال = جەمە . جەمۆ . جمۆ . جەمۆك

اسماعیل = سمە . سیمۆ . سمایل . سمۆك . سمایلوك .سمۆك

معروف = مالە .مالۆ .مەعرف .

مەعریف .مەعرۆ .مالۆك .مەگرووف

علی = عەلە . عەلۆ . عەلك . عەلۆك

جلال = جەلۆ . جەلعوت . جلە . جەلۆك

فاتح = تیحۆ . تیحە . فەتۆ . فەتۆك

رؤوف = ئوفە . رەفۆ . رەپە . رەفۆك

خضر = خدە . خدر . خدۆ . خدێ . خدۆك

ابراهیم = ئیبە . ئیبۆ . ئیباو . برۆ . برایم . برهۆ . ئیبۆك

رسول = سولە . رەسویل . رەسولۆك

رشید = رەشۆ . رەشە . رەشێ .رەشۆك

بكر = بەكۆ . بەكە . بەكۆك . بەكرۆك

شاكر = شەكۆ . شوكە . شەكە . شەكۆك

طلعت = تەلۆ . تەلە . تەعۆ . تەلۆك

رمضان = رەمۆ . رەمە . رەمۆك

یاسین = یاسە . یاسۆ . یاسۆك

كریم = كەرە . كەرۆ . كەرۆك . كەریمۆك

شێخ = شیخۆ . شێخە . شێخۆك

عباس = هەباس . هەباسە . هەباسۆك

فارس = فارە . فارۆ . فەرۆك

فیكرت = فەكە . فیكۆ . فیكۆك

سلمان = سلە . سەلۆ . سەلۆك

امین = ئەمە . ئەمۆ . ئەمۆك

سیف‌الدین = سەفە . سەیفە . سەیفۆ .سەیفۆك

محی الدین = محە .محۆ . محێ . محۆك

شمس‌الدین = شەمسی . شەمسۆ . شەمدین . شەمسۆك

بهاءالدین = بهۆ . بادۆ . بادین . بادۆك .

عبدالله = عەبە . عەبۆ . عەولاً .ئەولاً .حەولاً .عەبۆك

ئەڤدال - ئەودال

فتح‌الله = فەتحۆ . فەتحی . فەتحۆك .فەتۆك

نصرالله = نەسە . نەسرۆ . نەسە . نەسۆك .تاد . .تاد . .

٣ - هەندێ ناوی لێكدراوی وا هەیە - كوردی بێ یا كوردی نەبێ - كورت و سووك و ساناو بچووك دەكرێ و دائەپاچرێ و ئەچێتە باڵ یەكەوە وەكو :

شێخ عبدالله = سێخەڵلا - شێخەوللا - شێخیل

ابو بكر = بابەكر

شێخ حسن = شێخەسەن . شێخ هەسەن .شێخ حەسۆ

كاك امیر = كاكەمیر . كامیر

کاکە شێخ = کاشێخ
مام عبدالله = مامەڵلا . مامەولاّ . مامعەولّ
محمدامین = حەمەمین . حەمەدەمین . حەمەومین .
کاك عباس = کاکەباس
باجی عائشە = باجیایش
حاجی امین = حاجیەمین . حاجی ئەمۆ
کاك نبی = کانەبی . . .

٤ – خۆ هەر وانیە ، کورد تەنیا ، ناوی بێگانە کورت و سووك و ساناو بچووك بکات و بەس ، بەڵکو ناوە رەسەن و خۆماڵییەکانی خۆیشی – بە کۆن و نوێوە – والی ئەکات و ئەیخاتە بەرتەوژمی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتی و زمانەوانی یە ، بەشێوەیێ مرۆڤ لە بەریا دۆشدا ئەمینی و حەیرانی ئەبێت . وەکو :

خورشید = خورشی . خورشە . خوشێ . خوشە . قورشید . قوشە
شاناز = شانە . شانێ . شەهۆ
پەریخان = پەخە . پەرۆ . پەرێ . پەریلۆك
شادان = شادە . شادی . شادۆ .
کلاوزێر = کلاو
پاکیزە = پەکە . پەکۆ
خەزان = خەزێ . خەزە . خەزۆ
شاسوار = شاسە . شاسۆ
دڵشاد = دڵە . دڵۆ .
پیربالّ = پیرە . پیرۆ
گوڵناز = گوڵە . گوڵێ
جوان = جوکە . جانێ
بەهار = بهۆ . بهە
نەژاد = نەژێ . نەژۆ
هەلاّلە = هەلّە . هەلّۆ
رووناك = روونە . روونێ
ژیان = ژیکە . ژیکۆ
نازەنین = نازە . نازێ . نازناز
ئاواز = ئاوە . ئاڤۆ

٥ – نەك ئەمەو بەس ، بەڵکو هەندێ ناو هەیە ، کە هەر بە یەکجاری لەکوردی‌دا ، ئاداری لە سەر پاداری نامێنی و سەروبن ئەکرێت و ئەگۆردرێت ، کە خۆی لە خۆی‌دا بارێکی کەی رێزمان و زمانی کوردی و چێژو زەوقی ئادەمیزادی کورد . سەراوەڵە ئەکاتەوە :

وەکو :
غفور = خەپە
محمود = خولە
یوسف = ووسو
انور = ئەنە
اسماعیل = سمکۆ .سمۆ
مصطفی = مچە . مچۆل .مستیل
فتاح = پەتە . پەتۆ
رحیم = حوتەنە
سلیمان = سیمان . . .
عمر = عونە . عولە

٦ – هەروا دیاردەیەکی تری ناولێنان و ناوو ناتۆرە لە کوردستانی ئێمەدا هەیە ، مایەی تێرامانێکی وردە ، ئەمیش پیاو بە ناوی (دایك)ی ناوزەد ئەکرێ . . ئەم دیاردەیە لە هەموو کۆمەڵگەیەکا هەیەو بۆ گەلی هۆی دیارو ئاشکرا ئەگەڕێتەوە . جا چ لە ئەنجامی رەوتی دایلەکتیکیانەی مێژووەوە بێت ، هەروەك چۆن (باخ ئۆفن)ی زانای ئەڵەمانی و خاوەنی کتێبی (دایکایەتی) کە لە ساڵی ١٨٦١ دا بلاّوکرایەوە و ئەمەی ساغ کردۆتەوە ولە دایکایەتیەوە دواوەو مەسەلەی پێشکەوتنی (قۆناغی دایکایەتی) سەلماندوە ، کە جاری جاران لەو باوەڕەدابوون کە قۆناغی (باوکایەتی) لە مێژووی بنەماڵەی مرۆڤایەتیدا کۆنترە . .

یا لە ئەنجامی ناوبانگ دەرکردنی (دایك)ەوە بێت جا چ بە ئازایی و چ بە کارو پیشەیەك و چ بە خراپی و بەدناوی . . ئەمەو زۆرجار لە کوردەواری‌دا ، زاراوەی (زگ) مانای (بنەماڵە) یا (بەرە) یا (تیرە) ئەگەیەنێ . . هەروا زاراوەی (زگماك)یش پیووەندی بەزگ‌و هەیەو دەوری (دایك) ئەسەلمێنێ – هەروا ووشەی (زە – زا – زێ) هەمدیس لە کوردی‌دا دەوری دایك دووپات ئەکاتەوەو پێوەندیەکی تەواویشی بە گەشەسەندنی مێژوویی (ژین)و (ژیان) و (ژان) و (ژن)ەوە هەیە . . واتە : لە (زێ)ی دایکەوە ژیان – بە مانا فراوانەکەی – کەوتۆتەوە . . وێنەو شێوەی (زێ)یش یا (روبار) هەر لە شێوەی پزدان و رەحمی ژن یا دایکەو مانای تەڕایی و ئاوەدانی و ژیان و ژیانەوەو سەوزی ئەبەخشێت ، تا ئێستایش زاراوەی (زاوزێ) و (شفتەزێ) بۆ مێینەی ئادەمزاد بەکار ئەهێنرێت و (زێ)ی ئاژەڵانیش دیارە ، چەند بە کار ئەهێنرێت . . وشەی (خوشکەزا)و (کورەزا) و (خالّۆزا)و (ئامۆزا) ش هەمدیس نیشانەیە بۆ دەوری (زێ) یا (زا) و لە ئەنجامیشا بۆ دەوری دایکایەتی پزو پزدانیش هەر بەو جۆرە . . . .

هەر لە کوردەواری‌دا . جاری وا هەیە ، گەر دووکەس لە شیرو مەمکی یەك دایکیان خوارد ، پێیان ئەوتری (هەمشیرە – هاوشیرە) ئەمەیش خۆی لە خۆی‌دا بایەخ بە قۆناغو دەوری (دایکایەتی ئەدات‌و پێشتری ئەخات ، سەرەرای ئەمەیش هەندێ جار – لە کوردەواری‌دا – کور یا (کچ) ئەبێ بە میراتگری خاسیەتی خاڵی خۆی ، ئەمەیش لە ئەنجامی ئەو پێوەندی‌یەی کە لە نێوان ئەوو خاڵ‌و خوشکەزادا هەیە ، کە راستەو راست نیشانەیەکە بۆ دەوری دیاری (دایکایەتی) و ئەنجامێکیشە لە رژێمی کۆنینەی دایکایەتی‌یەوە کەوتۆتەوە ، وەك لە هەندێ ناوی نێو ئەم باسەدا خۆی ئەنوێنێ .
بەلاّم بە رای خۆم‌و سەرباری ئەم هەموو راستی‌و دیاردانەیش ، وا نیە بیرای بیر مەسەلەی ناولێنانی ئادەمیزاد بە ناوی (دایکی)یەوە ، هەر تەنیا دەوری (دایك)و قۆناغی (دایکایەتی) بسەلمێنێ‌و بەس ، چونکە کۆمەلّ لە گشت قۆناغەکانیدا ، سیستەمێکی کۆمەلایەتی‌یەو گەلّی هۆو رەگەزو بیروباوەری نوێ‌و کۆنیش کاری تێ ئەکات . . بە هەر حالّ ئەم بابەتە ، بابەتێکی زۆر بایەخدارەو پێداویستیەکی زۆری بە لێکۆڵینەوە هەیە . . نمونەکانیش وەك ئەمانەن :
« ئەمەری خانزاد – خولە گوڵچین – برایمی فاتە – سوارەی ناسکێ – بەکری – خاتە – حەمەی ئایشێ – پیرۆتی زین – خورشەی کلاو– عەبەی فاتە کوێستانی– حوسەی – ئامەموکریانی – جەمەی هەیبەتی گەرمیانی – حسەی حەلاو – بەکوێ خامە – مچەی عەیشێ – رەپەی خەجە کۆر – عەزەی خەجەکەچەلّ – قالەی باجی پیرۆز – ئەحەی پوورە ئایشە – علی ئەسمەر – خولەپیزە – حەمەی چوار خاتوونە – عەبێ خازە – عەلەعەمبەر – عەبۆی‌خەرامان – کریمی‌عاسە – عزیزی حاجی فاتم – علی شەونم – رەفەی ئامە – مالەی – حەپسە – ئەحەی فەتحیە – وسوی پوورەبحان – عەلی‌بێ مەدینابێ – قادری ناجی‌بابێ – عەمێ گوزێ – قاسمی حەبۆ – حەیدەری زبە – ئەکەی مریەم – قادری فاتەکە – عەلۆی ناجیە – ئەحمەدی فاتمە رەشێ – فریادی لەعلی – محەی بەگیسی – عەزیزی حەمرابێ – محمدی پلێ– چەتۆی مینا – عەزۆی ئەستی – ئەحەی شیرین . . . »

٧ – ناوو نازناوی بنەماڵەو (بەرەباب) وەکو :

| | |
|---|---|
| بەرەی زێرین | مالا توتی |
| بەرەی مرۆت | مالا شێتی |
| بەرەی کاکەخانی | مالا برسی‌بەگێ |
| بەرەی شەم | مالا سینەمی |
| بەرەی خەندان | مالا شەهنازێ |
| بەرەی فەرحاناغا | مالا خەندێ |

٨ – هەروا چ بۆ تەوس بێ ، چ بۆ ناوبانگ‌و چ بۆ جوانی‌و بۆ ناتۆرە ، ژن بە ناوی مێردی‌یەوە ناوزەد ئەکرێ ، ئەمەیش هەمدیس قۆناغێکی کەی کۆمەلایەتیان بۆ دەس‌نیشان ئەکات . وەکو .

حەلیمەی قاسمی
عەیشێ‌ی محمدی
سەلیمەی عەلۆ
گوڵەی عەلۆلوولە
سەبەی حەمەی کلاوترن
زبەی خەلە
بەدەی حەمە جان
فاتەی حەمە سوور
مەیانەی عەلی بەگێ

٩ – هەروا مێرد یا پیاو بە شێوەیەکی گشتی) هەر بۆ هەمان مەبەست ، بە ناوی ئافرەت یا ژنی‌یەوە ، ناو ئەبری بە تایبەتی گەر کەسایەتی ژنەکە ناودارترو بەهێزتر بوو ، پیاوەکەیش کەساس‌و بێکارو بێ نموودو لاورگە بوو . بەلاّم ئەم دیاردەیە لەکوردەواری‌دا زۆر کەمە . وەکو :

بلەی شووکە قژێژ
جلەی زبەی دان جیڕ
خولەی کالێ
محۆی جەمیلە
عەبۆی عەیشێ
ئەحەی زێبا
عەلەی مینا
مچەی قەدە

١٠ – هەروا وا ئەبێ، گەلّی جار ناوی (دایك) یێکی دیار ، ئەبێ بە ناوێکی (گشتی) بۆ سەرجەمی بەرەباب‌و تیرەیێکی فراوان‌و ئەکشێتە سەرناوی هەموویان ، هەر لە (خەسوو) و (بووك) و (خالّ)و (مام ەوە بگرە ، تا (خەزوور) و (پووزرا) و (ئامۆزا) و (خوازرا) و (کوڕەزا) و (کچەزا) و (کوڕەزازا) و (کچەزازا) . . . وەکو .

عەلەی رەندان
حەبەی رەندان
حەمەی رەندان
فاتەی رەندان . . . تاد
فاتمی خەزالێ
حەمەدی خەزالێ
واحیدی خەزالێ

ئەگەر لەبۆتەی خوێندندا بیانکولاْنیایە ئۆخەی نەئەکرد واتە بەشیرەوە ئەم پیشەیەی وەرگرتوە .

بەم چەشنە لەم قۆناغە مێژوویيەی ژیانی دا لە لەشکری عوسمانی‌دا پلە بەپلە سەرکەوتنی بەدی‌ئەهێنا تاگەیشتە پۆپەی هەرە بەرزی . . . وجێگای تایبەتی‌و گرنگی لەم دەزگایە دا وەرگرت . .

ژیانی ئەم قوناغەی ناوبراو بریتیبو لە ژیانێکی ئاسایی سەربازی‌و بەس ، بلیمەتیو لێهاتوویی ناوبراو تەنها لەمەیدانی سەربازی‌و نیشانەوە وەرگرتن‌و دانانی کتێب‌و نامیلکەی سەربازی بەزمانی تورکی وفێربونی زمانە بێگانەکان وەکو ئینگلیزی وفەرەنسی‌و روسی‌و وەگەشت‌وەری بۆ ئەنجامدانی کاری دەولەت بو فەرەنساو روسیاو تێکرا ولاْتەکانی تری ئەوروپا بوو .

پریشکی بەتینی شورشی گەورەی فەرەنسە – ١٧٨٩ – بیروراى پرشنگداری برایەتی ، ئازادی ، یەکیەتی . . . ئاگری لە تەخت‌و بەختی رزیوی گەنگەلی دەولەتی عوسمانی بەردا ، چاوو مێشکی رۆشنبیران‌و گەلانی ژێردەستی دەولەتی عوسمانی رووناك کردەوەو بەئاگای هێنان . بۆیە گەلانی عوسمانی بۆ خەبات دێنەکۆری مەیدانەوە بەتێکرای بی‌من‌و تۆتۆی بانگی راهێشتنی مردن‌و ناشتنی پیاوە نەخۆشەکە کەسەری لە گویْ گۆر ئەلەرزی‌وە ئەدەن . بۆ یەکەم جار دژی سولْتان ودارودەستەی شۆرشی مشروطیە لە سالْی – ١٩٠٨ – بەرپا ئەکەن .

بەم چەشنە سولْتان عبدالحمید بەناچاری مل بۆ هێزی گەلانی عوسمانی‌و داخوازیە رەواکانی شۆر ئەکات . . وەکۆمەلْی ئەتیحادو تەرقی سەرکردەی ئەم راپەرینەیە . . جلەوی کار وەرئەگریْ . بی‌گومان گەلانی ژێردەستەی دەولْەتی عوسمانی هیواو ئومێدێکی گەورەو بەهێزیان بەم راپەرینە بەستبوو ، بەلاْم بەداخەوە گولْی هیوای بەرزیان هەرلەیەکەم رۆژەوە سیس بوو بۆیە لەم هەلْوێستەدا گەلانی ژێردەست هەریەکەیان لە کلاورۆژنەی بەرژەوەندی نەتەوەیی‌وە ریبازی تایبەتی خۆی گرتەبەرو لە پێناوی پارێزگاری خۆی‌و وولاْتی‌و وچارەنوسی دواڕۆژی‌دا دەستیان بە خەبات کرد هاتنی دارودەستەی ئەتحادیەکان بۆ سەردەزگای دەسەلاْت داری بەیەکجاری شیرازەی یەکیەتی گەلانی ژێردەستەی دەولْ/تی عوسمانی پسان‌و بارودۆخێکی تازەی هێنایەکایەوە .

جێگای خۆیەتی لێرەدا بلْێن کە راپەرینی مەشروطیەتی عوسمانی بە رووداوێکی گرنگ‌و بەووریابونەوەیەکی روشنبیرانە بۆ گەلانی ژێردەستەی دەولْ/تی عوسمانی دائەنریْ .

رۆشنبیرانی کوردیش ئاگری ئەم راپەرینە ، دلْ‌ودەرونی هەژاندن‌و خستنیە ناودەریایی بیرکردنەوەو ووریابوونەوە وەبەرەو کۆری خەباتی نەتەوایەتی هاوچەرخ راپێچی کردن . ئەتوانین نمونەی بەئاگاهاتن‌و دەوری کاریگەری مشروطیەی عوسمانی لە بیروڕای مامۆستا محمد ئەمین زەکی بەگدا ببینین کەوا لەخوارەوە بە کورتی‌و پوختەیی ئەینووسین :–

مامۆستا محمد ئەمین زەکی دەلْێت . «کاتیْ ووشەی عوسمانی لە تورکیادا سرایەوەو پێچرایەوەو ووشەی تۆرانی تازەداهات‌و جێگەی گرت ، ئەم کارە بەرەنگیْ کاری کردەسەرم کە منیش بەوێنەی ئەوکەسانەی کە لەنەتەوەی تورك نەبوون هەستم بە نەتەوایەتی خۆم کردو ویستم هەستی هەلْچونی نەتەوایەتیم بەتوندی‌و بەهێز دەربخەم» .

واتە مشروطیەت بەجاریْ دلْ‌و دەرونی رۆشنبیرانی کوردی هێنایە هەژان ، بیرومێشکی راچلەکاندن‌و راپێچی کۆری مەیدانی نەتەوایەتی هاوچەرخی کردن .

بۆیە ئەتوانین بلْێن کە سەرەتای بیرکردنەوەو هەست بەگیانی نەتەوایەتی کردن‌و قەلْەم هەلْگرتنی ناوبراو بۆ نوسینی مێژووی کورد بۆ سالْی – ١٩٠٨ – ئەگەرێتەوە ،

کاتیْ کە ناوبراو تەمەنی لە –٢٨– سالْیدا بوو . شیاوی باسە کە مرۆڤ لەم تەمەنەدا پاش ئەوەی بەهەلْبەزو دابەزی تاقی‌کردنەوەی ژیاندا ئەروا . . بەبیرێکی قالْ ، بەدلْێکی گەورەو خاوێنەوە رووداوی تازە ، بیروڕای نوویْ هەلْئەسەنگێنی‌و ئەی‌نرخێنیْ . بۆیە ناوبراو بەچاوێکی خێرایی بەرابردووی ژیانی‌دا هاتەوەو بە بیرێکی والاْ بێژی هاوچەرخ‌و مێشکێکی رووناك ، بە دلْێکی گەورەی پڕخۆزگەوە بە ناو هاتە مەیدانی نوسینەوەو دەستی کرد بە تۆمارکردنی مێژووی گەلی کورد . .

بەم چەشنە مامۆستا ئەمین زەکی وێنەو نیگاری بارو دۆخی ناساز رۆژگاری ناهەمواری ئەو سەردەمەمان بە ووردی‌و دانایی بۆ ئەکێشی ئەوهەل‌و مەرجە گونجاوەی کەبۆ رۆشنبیرانی کورد لەم چەرخەدا رەخسابو بە روونی پیشان ئەدا وەهەوێنی چەکەرەکردنی گیان‌و بیری نەتەوایەتی هاوچەرخ‌و سەرهەلْدانی تی‌کۆشانی نەتەوایەتی . . . . ئەخاتە روو لەدوایی دا وەلەباسی سەرگوزەشتەی خۆیەوە . . . دەرگای کۆششی بی‌وێنەی خۆیمان بۆ دانانی کتێبی مێژووی کوردو کوردستان بو ئەکاتەوە . . . .

وەدەڵێت ووشەی عوسمانی دەماری هەریەکێکی لە ئێمەی ڕۆڵەی نەتەوەکانی تری غەیرە تورکی سڕ کردبو .

کەس نەبو باسی ڕەگەزی نەتەوایەتی تایبەتی خۆی بکا واتە دەوڵەتی عوسمانی بەوێنەی دەزگایەکی چەوسێنەرەوە تێکرا گەلانی ژێر دەستەیی بەنەتەوەی تورکەوە ئەچەوساندەوە بۆیە لەم قۆناغە مێژوییەدا تێکۆشانی نەتەوایەتی کزوو سڕو لەبەر چاونەبو . مامۆستا ئەمین زەکی بەگ بە دڵێ تەنگی بەدەم ئاخ و ئۆفەوە باسی ئەم دەورەمان بۆ ئەکا دەڵێت :

. (نەم ئەزانی ڕیشەی نەتەوایەتیم بۆ کوێ ئەگەڕایەوە چونکە لە ژیانمدا هیچ لەم بارەیەوەم . . . . نەئەخوێندو نەئەزانی) واتە پاش مەشروطیەت وەکو لەئاسمان بکەوێتەخوارەوە . . . . دڵ و دەروونمان کەوتە هەژان و ڕاچڵەکین) وەدەڵێت ( کەوتمە قسەو پرسیار لەگەڵ خۆمدا ئەم پرسی ئەشێ نەتەوەی کورد بۆچ ڕیشەو ڕەگەزێك بگەڕێتەوە ؟ بەڵام بێ وەڵام ئەمامەوە ! تەنانەت کەوتمە پرسیار کردنیش لە هەندێ ئاشناو دۆستیش . . .هەر بێ سوودبو) . . . ئیتر بارووددۆخی تازەی کورد . . . دڵ و دەروونی مامۆستا ڕائەچڵەکان بۆیە وەك هەنگی برسی کەوتە گەشت بەگوڵ گوڵزارادا وەك مەلەوانێکی کارامە کەوتە مەلە بەناو دەریای زانیندا وەك زانایەکی دڵسۆز شەوو ڕۆژی لێك ئەدا ، سەری بەسەر کتێبی هەمە جۆرە شۆڕ ئەکردەوە بۆ مەبەستی بەرزی کام ڕێگەی سەخت بوو ئەی گرتەبەر لەهەموو کتێبێکی بیگانەدا بەهەر زمانێکێ بوایە گەوهەرێکی هەڵ ئەبژارد تاله ئەنجامدا بەپشتیوانی زۆر دۆست و ئاشناو توانی کتێبی مێژووی کوردو کوردستان شاکاری بەرهەمی پیرۆزی لە ساڵی -١٩٣١- بەکوردی بخاتە بازاری کزو کەساسی ڕۆشنبیری کوردەوە .

کەبەمە دەرگایەکی گەورەی بۆ نەوەی هاوچەرخ کردەوەوە سامانێکی نەتەوەی مەزنی پێشکەش بەنەتەوەکەی کرد کە بەهۆیەوە نازناوی مێژوونوسی مەزنی هاوچەرخی بە باڵادا براوو ناوی بە نەمری و مەزنی لەناو خوێنەوارانی کوردا دەرکرد .

بەڕاستی پێویستە جوڵانەوەی ڕۆشنبیرانی کورد لە کلافەی ژیاننامەی زانای بەرێز ، لە هەڵوێست و ڕیبازی لە پەندو ئامۆژگاریەکانی لە خۆپێگەیاندنی هەڵکەوتنی وەکو مێژوونوسێکی کوردی هاوچەرخ کەڵك و سوودی بەپێز وەربگرن . . . .

بۆ نمونە پێویستە بەووردی پلەی ژیانی ئەو گۆڕانکاریە بنەڕەتیە گرنگەی کە بەسەر زانایی ناوبراو هاتووە بە ووردی بخوێنێ وەدەرسی بەنرخی لێ وەربگرێ ئەوبارو دۆخەشی بکەیتەوە وەوەهەڵسەنگێنێت کە بۆچی زانای ناوبراو بە گروکفێ لە فەرمانبەرێکی پایەداری خاوەن نیشانە هەڵگری زۆر لە لەشکری عوسمانی دا هەوارگەی کاروانی خۆی بگۆڕی و دەستی بداتە خامەوبکەوێتە نوسین لەسەر مێژووی گەلە کەساسە بێ کەسەکەی .

بۆچی لە کاتێکدا بەرهەمەکانی تێکرا بەزمانی تورکی وە لەسەر ڕووداوی سەربازی قەوماوی جەنگ بوو کەچی ڕووی لەم ڕێبازو هەڵویستە وەرگەڕان . . . . وەخۆی هاویشتە ناو مەیدانی نووسینی و کوردی و مێژووی نەتەوەکەی ووتی ! « ناشیرین و نەنگە کە مێژووی کوردو کوردستان دانێ نوسینەکەی بەزمانی زگماکی نەتەوەکەی نەبێ» وەبکەوێتە ڕەخنەگرتن لە نوسەرو مێژوونووسانی پێش خۆی کە دەڵێت «بۆزانای گەورەی کورد ادریسی بدلیس ئەگەر کتێبە مێژوییەکەی هەشت بەهەشت کەلەسەر دەوڵەتی عوسمانی و سوڵتان بایزیدی عوسمانی ئەدوێ بەزمانی فارسی بێ چونکە نوسەر باسی مێژووی نەتەوەیەکی تر ئەکا» .

«بەڵام ئەمیرخانی بدلیس ئەبێ چ چەشنە بەڵگەو بەهانەیەکی هەبێ کە کاتێ شەرفنامەی کەلەسەر مێژووی نەتەوەی کورد ئەدوێ بە زمانی فارسی بێ» جائەم گۆڕانکاریە بەهێزەی کە لەژیانی زانای ناوبراودا ڕووی دا کارێکی وای کردە سەر کە شاکاری بەرهەمی مێژووی کوردو کوردستان بەزمانی کوردی دابنێ لە کاتێکدا . . . . کە جوڵانەوەی ڕۆشنبیرانی کورد لەبارێکی دژوارو ناقولادا ئەژیا . . . وەختی کە تەنها گەلی کورد لە عێراقدا ڕۆژنامەیەك ژیان لە سلێمانی وەگۆڤاری زاری کرمانجی لە ڕەواندوزی هەبوو لە بارودۆخێك دابوو کە هێشتا خوێنی لاوەکانی ڕاپەڕینەکەی شەشی ڕەشی ئەیلول لە باخچەی سەرای سلێمانی دا ووشك نەبووەوە شێخی گەورەش شێخ محمودی نەمر لە ئەعظمیە لە بەغدا بەدەست بەسەریەوە ژیانی ئەبردە سەر لە کاتێك دا بوو کەکاروانی خوێنەواری کورد لە پلەیەکی نزم و کزو کەساس دا ئەژیا ئیتر لەم هەڵوێستە دا بەش بەحاڵی خۆم هەر ئەوەندەم لە تواناد بوو کە بەرامبەر ئەم یادی پیرۆزی مێژوونوسی گەورەمان پێشکەش بە خوێندەواارانی بکەم کوردواتانی دیاری دەستی شوانهەرشەنگنوو هەڵەکۆك . بەڵام ئەرکی گەورەو فەرمانی مەزن بۆ ئەم یادکردنە گەورەیە ئەکەوێتە سەرئەستۆی تێکرا جوڵانەوەی ڕۆشنبیرانی کورد .

لەدوایی دا کۆتایی باسەکەمان بەم پارچە هۆنراوەی

پیرەمێردی نەمر هاورێی زانای گەورە ئەهێنین کە بەبۆنەی کۆچ‌کردنی مامۆستا ئەمین زەکی بەگەوە کە ڕێکەوتی مانگی تەموزی - ١٩٤٨ - ئەکاداوئەڵێ :

**«شیوەنی ئەمین زەکی بەگ»**

چـــرای ڕوونـــاکی کورد کوژابـــەوە
تـــەختی سلـــێمانی تـــەخت کـــرایـــەوە
تۆمـــاری کوردی تـــأریخهـــەڵپـــێچـــرا
پـــەردەی ڕەش بـــەرووی ئـــەدەبدا کـــێشرا
ئـــەمین زەکی بـــەگ ڕۆژی ڕەمـــەزان
هـــەوارگەی بـــردە سەرگردی سەیوان
لـــەوساکـــە ئـــەو ئـــەسپـــەردەی گڵە
فـــرمـــێسك تـــێکـــەڵ بـــە خوێنی دڵە
دەرکـــەوت زاتێ بوو بـــەعـــەهـــدو پـــەیمان
لـــەدوای ڕۆژا هـــاتـــەوە نـــاومـــان
بۆمـــیلـــەتـــەکـــەی هـــێنـــد تێ‌کۆش بوو
قـــەڵەمی دەستو پـــەنجەی شکـــابوو
دیســـان بۆ پـــێنـــجوین تێ‌کۆشایـــەوە
خـــەبـــەر ! (ئـــاو گڵ‌وا هـــێنایـــەوە)
تـــاچـــەرخی دەوران لـــەکـــار ئـــەکـــەوێ
پـــیـــاوێکی وامـــان تـــیـــاهـــەڵنـــاکـــەوێ
دایـــکی خـــاك وەهـــای گرتۆتـــە بـــاوەش
ئـــازاری پـــەنجەی کـــردوە فـــەرامۆش
بـــەڵام من یـــەنـــدی جـــەرگم بـــراوە
زوو نـــەگەمـــە لای کـــارم شێواوە

گەلاوێژ ژمـــارەی ٧ی ساڵی ١٩٤٨

# بچویك گولە . . گەش بهێلە

صدیق خالد هروری

باخچێ کو بهێتە چێکرن ، ژهەمی تۆخم‌و ڕەنگێت گولا لێ چاندین چاڤەرێی بهارەکێیە سۆلین‌و بوشکوژا گەش بکەت ، دا باغ بخملیت ، مالی تێکدا بکەملیت . دەمێ دارەکا بەری بهێتە چاندن ، پێتڤیێ تێ خەپارە و کولانێیە ژ چەڤێد زیندەو کرم‌و دەردێ پاراستنێ ، داژ فێقێ‌یێ وێ زوی بگەهیت یان نزیێ بیزاڤـو ئازرین تێدا کار بکەی‌و بهل خەپرینێ و بکەزینخی سوبەهی دێ بیتە ڕەز .

بچویك ژی هەروەکی ڤان هەمی تشتا پێتڤی پویتەکێ مەزن‌و چاڤ دێریەکا بەردەوامە . .

باب‌و باپیرا ڕێکا ژینێ ڤەوژارتی‌یە و ڕیا دورووست ئاشکرا کرییە ، ژبەر هندێ ئەڤەژی ژبیر نەکرو لسەر بەری نەخشاند ( شفکێ بتەرینی بچەمینە) . بەلێ ، مادەم بچویکە ڕێڤەبەرو کاربەدەستێ پاشە ڕۆژێ ، کەڤی‌و بەربەستا ئاستەنگ و گرفتاریا ، هۆلکا ڕۆژگارا بێ بەخت و مروەت ، پرا کاروانێ بۆش‌و ڕێ دویر ، ئەرێ پا بوو لاندکێ تاکەینە خاندنگەهەکا بشەرەگەهو برا هاڤیژ؟ ، بۆ مال ، راکەینە گەرەکا بزڤرۆك ، ڤێر بکەین چەوا دێ مەلەڤان بیت ڤان سیپەل و پێلا شکێنیت ؟ ، بو ئەڤادیینین و بینای ناکەینە گۆهارك‌و بکەین گۆهی ؟ ، دا سۆبەی بزانیت ئێك‌و ئێك دێ بیتە دوو ! . . . دا ڕەش و سپی ژێك جودا کەت ! .

دایکینە ! بابینە ! ئەڤ دیاریا بەرکەفتی و هێزا هیڤی و



ئومێدا چەند سالا تافراکە دبیت ، دڤێت پشکەکێ ژ رەهەنی و تەناهیا خۆ هەتا ژگیان و ژ ژیناخۆ بۆبکەی شەپەر .

دایکا خۆشتڤی ، بچویك راکرن بارەکێ گران و بسەنگە ، بهێزو شیانەکا تێر ئەڤ باری دێ هەلگری ، بخۆدانکرنا درست و تەرس‌دانا بچویکی لسەر شەنگستێت دەرووی دانایە و تەخسیری ژدای – باباڤە نەبیت ، نەخاسم دایك ، زۆرتر دگەل رادبیت و هەمی داخازو نەرازی بوونا وهاڤێتە بەر ، چونکی ئەگەر تێشکێت گیاندارا بێ‌ی دایك ببڤن و هەتا دێ ژین بچویك قەت بێ‌ی سەخێریا دایکێ ناژیت . ژبەر هندێ پێڤي میهرەبانی و دایگۆرێ‌یە ، حەتا سەحکرنێت زانا دیارکر کو بچویکێ دبن سیبەرا شیرو دەنگێ دایکێڤە ژیای پتر بێ بەرایە دخاندنێداو پتر بەختەوەرە دژینێدا .

دگۆڤارا (الدوحه) هژمارا (٧٥)یێ بابەکی کاغەزەك بۆ بچویکێت فلسطینێ هنارت و گوتی : ئەم ناهیڤیێ‌ینە و مەنەڤێتن بچویکێدمە رابن مەلیل و دامای ، بێ هیڤي و بێ دەنگ ، پۆ سیدە . مە ژوان دڤێت رۆژەکا نوی ژمەرا بهەلێن . هیڤێین مە بزڤرین ، کویرو موکوم بچین دائێدی باوو بارۆڤە نەدەرێخن و لگەلخۆ ببەن ، مە ژێ دڤێت ژ شیانەکا پێڤە هاتی ژنەکا نوی بدەستڤە بینن . مە دڤێت لشوینا بێ هیڤي‌یێ هیڤي‌یا بچینن ، لشوینا لاوازیێ ئازایەتی و چەلەنگی‌یێ بچەقینن ، لشوینا هژیان و لەقیانێ موکوم بوون و خۆگرتنێ ، شوینا خەم و کوڤانا دلخۆشی و شادو شاهی‌یێ .

دیسا بۆ دخۆریتو دێتێ : دڤێت تێ بگەهەین کو دیناتیا گەنجەکی تەمەت شیان و زانینا چەلەنگەکی‌یە دەمێ چەلەنگی دهێت ژوی بخو و گاز . . رزگاری‌نێ ، وەکی (ڤیکتور هیگو) و گۆتناوی درۆشمەك بیت لسەر ئەنی‌یێ (ئەزێ دبینم ، من هایژی‌یە ، دێ وەرمیت و پەقینم ، نێ ئەزیەد دانێ خەما خۆ لدەڤ من نینە) . هەر هۆسا غاندی و مشەشتی‌وی شیان ژبچویکاتی بن هێلینکا خەبتین و سەرکەوتنێ دناڤ دلێ خۆدا چێکەن .

بەلێ دایکا عەزیز ئەڤ تفالێ لسەر دەستێن تەیە جیهانەك پێ شاهی ، باشە رۆژەك خبچێت بەرەڤ ئەڤراز و راچاندنەکا هویرو همبس بۆدکێشیت .

ئڤجا ژتە دڤێت فێر بکەی چەوا ئەڤ بارێ لهیڤي‌یێ مای دێ هەلگریت ، دێ چەوا خۆلبەر سەرماو گەرمێ گریت . تەژی دیارە چو ژێ کێم نینەو یاپێ چێ بۆی ، وەك خەتیرەکا نەهێتە قەمراندن ، وەك کانیکەکا ژخێرو خێراتا نەچلك بیت . چونکی بچویك تەمبویرەکە پێتڤي تبلێت نەرمو نازکە تا بئاوازێت جوان و دلخۆش ببێژیت .

ئێدی ژبو پەیدابوونا زەلامەکێ ژێهاتی و پێ‌چێ بووی ، ژبو پاشە رۆژەکا رۆهن و گەش ، ژبو سەمیانەکێ خۆرستی و سەربلند بچویکێ خۆ ژهەمی لایاڤە پویتە پێ بدەو چاڤ بدەلێ .

١ – گرنژنا دێم بۆشکۆری ، رۆژەکا هەلاتی‌یە :

دایکا هێژا ، بچویك گەلکو دبیت ژبلی گری تێر بوونەك دڤێتو هند ! ، دزانی دارێ گولێ چەقو سترینە – چ پێ دڤێت داژڤان ستری‌و چەڤا گولەکا گەش بپشکڤیت ؟ ! . بچویك ژی گولە ، گەر تەڤیا . . . . ؟ دێ بشکڤیتو گرنژیت .

بچویك پتر دێ‌ی كەیف خۆش‌و بەشۆش بیت ئەگەر دای – باب پشكدار بن دئاخفتن‌و پسیارو بەرسڤادا ، دیاری‌و حەنەكادا .

هەڤپشكیا بچویكی دیاری‌یا (مالكانێ) دا ، هەروەچكی زانایێت دەروونی‌و كۆمەلّی خۆیا دەكەن ، داكو پتر بچویكی زرتەكی هەبیت‌و باوەری بۆ پەیدا ببیت ، ئەڤ بچویكێ هۆدەمێ دەچیتە ناڤ هەڤالاژی هەردێ بویێ كەلێ خۆریت و دێ زالێ بیت دسەر گێم و زاباو ریكخستنێدا ، ئۆ ئەڤێ دێ كارەكێ مەزن هەبیت لسەر ئاڤاكرن‌و موكوم كرنا كەسایەتیا وی دپاشەرۆژێ‌دا . ئڤجار پێڤی‌یە دایك‌و باب ژ وەختێ خۆ بهاڤێنە سەر وەختێ دگەل بچویكی دازێدەتر فێربیت‌و هشیارو چەلەنگ ببیت .

دایكێ كارەكێ خۆیاو سەر راست لسەر ژین و ئژبارا بچویكی هەیە ئۆ یەكەمین خاندنگەهـ كو مرۆڤ لێ فێر دبیت (خاندنگەها دایكێ)یە ، دایكە خۆدان‌و رێڤەبەرا ڤێ مەكتەبێ و هەمی شیان‌و زانینا خۆ دێ مەزێخیت ژ پیخەمەتی ڤی كەسێ پێتڤی ، ژبەر هندێ ئەڤ دایكە ژهەژی ری‌و ئاراستێت ئاشكراو دروستە لسەر پێبكێت زانیێ بسەرهاتنێ .

قۆناغا ئێكێ – نێزیكی ژی‌یێ دوو سالی‌یێ دگریت ، ئێدی قۆناغا دووێ كویا پەروەردەو تێگەهاندنێ‌یە ، دڤێ قۆناغێدا پشتی كو فێری زمان‌و گوتن و ئاخفتنا دبیت فێرگەها هەنێ دشێت هزرو بیرێن‌وی بزڤینیت و لسەر رێكەكا خۆسەردانای برێڤەببەت ، ئۆ هۆسا دێ دەمێت خارنێ‌و نڤستنێ‌و بێهن ڤەدانێ بۆ ئاشكرا كەت و پشتیكو هەمی ئەندامێت پێ‌حەسیانێ دزانیت .

هۆسا دێ پێڤە چیت تاكو ژكەلە ڤی و دەروونی‌و ئاقلی ڤە گەش دبیت ، دیسا ئەڤ مەكتەبە دێ بنكێت ڤینێ بۆدانیت و ئاڤاكەت هەتا هەردوو ڤینا وەلاتی‌و مللەتی خۆ لسەر دگریت . هەر ئەڤ زانینە دخۆیاتیا بچویكیدا بەرە – بەرە ڤەدگرن داكو ئاڤاهی‌یێ دەروونی بنژینن ، پاشی كار دكەنە سەر قەبەرخوەكرن‌و كارێت تڤایی ، بۆ پاشە رۆژا دویرو نێزیك ، ژگەنجینی و پیرو كالی‌یێ .

٢ – بوی كراسێ ترسێ دكەیە بەر بچویكێ خۆ ؟

ترس دیاردەكا خۆیاو ئاشكرایە ، كەس ژمەزن‌و بچویكا ژێ بێ بەهەر نینەو ژ ژینا هەر كەسەكی دچەریت ، بەلێ گەلەك جار ئەڤ ئێشە دێ سەری ژ ژینێ ستینیت‌و مرۆڤی بێ دەست و پی‌كەت ! .

لێ مخابن پتر هەنە هەر ژ رۆژێن سەری ژ ژینا تفالی دێ (سەرێ چویڤكی نیشادەن) ووەكی (مارگەستی ژ وەریسی د ترسیت) زوی زویێ چرسكین و ترسی‌كەنە د دلیدا ، هەروەكی دێ بێتێ :

(هشبەئەزمان سۆركێت هاتن !) یان (سەر كرینكێت هاتن !) یان (دێ ئەجن‌و عەجیجیك‌و مەجیجك هێنەتە !) هۆسا دێ ئاخفتنێت طەریێڤ‌و كرێت كەنە رەشەو هەلامەت تێكەلی خەونەكا ترسناك‌و درندەكەن ، یان ژی دێ دەهبا بۆكەنە سەهم‌و پی‌بزدینن .

د ختۆریت پسپۆر دوو تۆخمێت ترسێ دیاردكەن :–

أ – ترسا سرۆشتی (خۆیی) :

ئەڤ رەنگێ ترسێ پێڤی‌یەو ڤەرە ژبۆ بەرەڤانی‌و پاراستنا ژینێ . ئۆ هاریكارە ژ بۆ پەیدا بوونا پەیوەندیێت راست‌و دروستێت كۆمەلایەتی ، چونكی ئەگەر مرۆڤ (مەزن‌و بچویك) ئەڤ تۆخمێ ترسێ نەبیت نەساخی‌یەكا بجنێیرو ڤەمانەكا ئنتیكەیە . ئەگەر بچویك ژ بلندی‌یێ نەترسیت دویر نینە خۆ دبانیدا پاڤێژیت یان ژ ئاڤێ نە ترسیت خۆ پاڤێتێ .

لسەر دایك‌و بابا فەرە بچویكی تێ بگەهینن‌و ڤی رەنگێ ترسێ نیشا بدەن لسەر ریا تازەو بێ خارو ڤیچ ، چونكی ئەڤە بچویكی پال ددەتە كریارێت جان‌و چاك ئۆ دویر دكەت ژپی‌رابینێت نەژهەژی وەكی دبێن (چویڤێ ترسێ بێ ژ بەحەشتێ هاتی) .

ب – ترس‌كە نەساخی :

ئەڤ تەرزێ ترسێ وەكی ترسیان ژ تاری‌یێ‌و مرۆڤاو گیاندارا و حەتا ژمەكتەبێ ، ئەڤ ترسە لدۆر وی بچویكی دزڤریت یێ دمالەكا نە ڤێك كەتی‌و پری ڤێكرا چوون‌و ئالزین دژیت ، ئەڤەیە بچویكی تویشی سەودا سەری‌و سەرگێژی‌یێ دكەت و ری‌یازینێ لبەر بەرزە دكەت .

ئەڤەو گیانداریێت كەهی پتر كار لسەر ترسا بچویكی هەیە چونكی هەردەم گەڤا دای‌و بابا لسەر ڤانا و هێشتا درندێت دی شتی گۆرگ و هرچا ، وەكی دێ بێتێ : ( هشبە هەكو دێ تە هاڤێمە بەر سەی ، یان گۆرگی !) یان ژی ڤان رەشا تێكەلی ترسا تاریاتی‌یێ كەت‌و بێتێ : ( شەڤە گورگی بدەڤە دێ مە بەت دكونا خوەڤە !) ئان دێ هندە خرافاتێت ڤهێت‌و ژراستی‌ی دروستی‌یێ ددویرو دەرواز ڤێرا بەر دەت و نقوومی خەونێت

کویرو گران کەت وەکی (یا شێخ پیرامیس تەددەستی شیرێ ریس نەهێت من کایید !) دێ پێ دەدەتە ژبەر کرن‌و کێفکاوی کەتە فەرشەکێ بسەنگ‌و بسەر دادەت ! .

ئەڤنە هەمی دسەرێ بچویکیدا دێ زێن‌و مەزن بن ئۆ دگەل ڤا دێ هندە بزڤینێت کەشە فرێت ژگیاندارێت کەهی ، یان دخەوێدا ، یان دفلمێد تێلفزیونێ بینیت‌و هێشتا پتر دێ لسەرێك ستویر بن ، ئەڤە دێ بنە ئەگەرا چەند نە خۆشێیت خۆجهی‌و ئاشکرا ج دژیێ بچویکابە تێیدا وەکی میستنا بخۆڤەو خەو چرکی و گریانە دژوار و خەونێت بسەهم ، ئۆ ج دژیێ زەلامینی بێدا وەکی ترسنووکی‌و پشت بخۆ نەگرتن‌و لە قلە قووکی (تردد) .

بچویك لژی‌یێ هەشت هەیڤێ ژکەسێت بیانی درەڤیت‌و د ترسیت ، لێ ئەڤ تشتە لدوورسێ سالی‌یێ نامینیت ، ئێدی ترسا ژهەما بەلاڤ تر لسالێن شەش‌و حەفتێ ژ ژی‌یێ بچویکی دەمێ دچیتە مەکتەبێ ، ئەو ژێك یان ژ سەیدای ترس دێ بۆ چێ بیت یان ژ هندە کەسێت دی ، چونکی تێکەلی هەمی تۆخمێت مرۆڤا بیت‌و گەلە تشتێت لدەڤ نەبووین و غەریب دێ بینیت ، ئەڤەژی پێتڤی تو خوبیب دانان‌و برینەکێ‌یە .

زۆر جار بچویك دێ خۆ ڤە چریت‌و کەتەگری‌و ژنفستنێ رەڤیت ، زانایێد دەروونی ترسا بچویکا ژ خەوێ ڤە حەجاندی‌یە :

بچویك هەست بتێکچوونەکا مەزن دکەت دەمێ دچیتە دناڤ جهێ خۆدا ، چونکی باورناکەت جارەکادی دێ رابیت‌ڤەو ژتارێ ، رووناهی‌یێ دێ بینیت‌ڤەو دناڤ کەس‌و کارادا ژیتە ڤە ، وەسا دزانیت کو تشتەك لگەلخۆ دێ بەت‌و نازڤرینیت ، ئڤجا لسەر دایکێ پێتڤی‌یە نەخاسمە گەر بچویکێ تویش بووی . بیت دگەل بمینیت‌و دەستێ خۆ پاڤێتە دەستێ وی و لاندکاوی بهژینیت ، حەیرانووك‌و دەنگە دەنگەك بۆ هەبیت هەتا دنڤیت ئەڤە هەمی داکو ئێمناتی‌یەك لدەڤ هەبیت‌و ژترسێ دوربیت .

پاشی دێ شی‌ی سپێدێ سەمکەی بچویکی دەمێ ژخەو رادبیت چەوا دگرنژیت‌و دبوشکۆریت .

هۆسا پاراستنا بچویکی ژترسێ پێتڤی‌یەکا دجهێ خۆدایە لسەر ملێت دایك و بابا ، ئەوژی دڤێت خێزان (ناڤ بەرا دایك‌و بابا) تەناو رەحەت بیت‌و ژهەمی شەرو شەرە دەڤا دویر پارێز بیت ، قلم و یاری یێد بترسی‌و قورس پی‌نەحەسین‌و چیرۆك‌و چیڤانووکێد نە ژ تەرز بۆ نەهێنە گۆتن ، ئەو تشتێت بچویك ژێ دترسیت لسەرخۆ و جوان پێ بدەنە نیاسین‌و خاسیەت و خەسلەتێت وان بۆ بهێنە گۆتن و بەرە بەرە نیزیك بکەن ، هەر پێهنگاڤەك ژڤان پالدانەك و مە دحەکاری‌یەك دگەلدابیت و قەت نابیت تەحن‌و شکاندنا تێ وەرکەن هەتا کو بزالێ بینەکێ دحەسیت و بستەهـ دبیت .

بنێرە ئەڤان شیرەتێن خارێ ، زانایێن دەروونی (علماء النفس) دبێنەتە :-

١ - بچویکی ژئاڤێ بترسیت ، پشتی دبەرا گۆتن و ناڤ تێدانەکا باش بلا پێد وی بۆدەمەکێ کێم دئاڤێدا بمینن پاشی پێلەل ترو . . .

هەتا هەمی تەردبیت و ئێدی تێهەلینە ، نابیت بجارەکێ تێ نقووم کەی ، هەروەکی زانایێت ساخلەمی‌یێ پشتا ڤێ چەندێ دگرن .

- هێسکا (یان پایسکل) بچویك ژێ کەفتی نە ڤەشێرە ، چونکی پتر دێ بۆبیتە گرێ‌و سەهم و رەڤین ، ئێدی سۆبەهی نەشتیت خۆ باڤێتێ‌ڤەو سیار بییتلێ .

- بچویکێ ژ سەی بترسیت ، دڤێت هەر بۆ بەحسێ سەی بجوانی‌و خاسیە تێدوی بێژن ، وەکی زێرەڤانیا مالێ دکەت‌و شڤانەتیا پەزی دکەت و . . .

- گەر ژ مەکتەبێ برەڤیت ، هەردەم پالدەو کو بخوینیت و فایدێ مەکتەب و خاندنێ بۆێژە د بەحسێ هندە هەڤال‌و کەسێد زیرەك‌و باش د خوینن و مەدحێد سەیدا بۆبکە .

- ئەگەر ژتاری‌یێ بترسیت ، بۆ نەکە رەشەو دمەزەلەکا رووناهـ بنڤینە .

٢ - بچویك ژوەستیکا هەتا پیا چوونێ :

دایکا هێژاو یالتە هیڤی‌یەو تەدڤێت ئەڤ گری‌یێ بچویك دکەت بیتە کەنی ، خۆشترین گاڤ ئەوە یادبینی دگەلتە دگرنژیت و دبۆشکۆریت . . . پاشی تە دڤێت ئەو رۆژ بهێت یاکۆ خۆ لوەستیکا دگریت و دێ گەلە ناڤ تێدەی‌و دبەرا بێژی ( وەستی وەستی گۆپالکێ شێخی د دەستی !) .

هۆسا دێ بینی بچویکێ تە پشتی هەیڤا دووێ ژبووناوی دشێت پێتخۆ راگریت . . . د هەیڤا چارێدا دێ دەتە خۆ دالسەر پێتخو راوەستیت ، ئەگەر تە هەردوو دەست لین کەفشابن . . .

وەهەیڤا شەشێدا دێ دەستێت خۆ هاڤێتە تشتەکی و

خۆلسەر پێت خۆ گریت ، دهەیڤا نەهێدا بهاریکاریەکا کێم دێ خۆگریت وبەلێ زوی زوی دێ کەڤیت ڤەو د بێت جارەکادی راکەبەڤە .

هەتا دویماهیکا سالا ئێکێ نیڤەك ژبچویکا پێت خۆ دهاڤێن بێی هاوبکاری ، دهەردوو هەیڤێن ئێکێ ژ سالا دووێ بچویك هەر بخۆ دێ برێڤە چیت .

پشتیکو بچویك ڤێیا کەفت ، پتر پێتڤی دێری‌و ئاگە هداری‌بێ‌یە نەخاسم ژرێڤە ، چونکی هەردەمێ خۆ دبینیت بێ دەرچوویە ژگەهگیری‌و بۆتیبوونەکا ژمێژ وەکی چویچکا فرا کەدبیت دێ ژکەیڤا هەر هێت‌و چیت وبژڤیت ، ژ ئاگری ژفراکەی ژئاڤێ ژکێرن ناترسیت‌و خوژێ نادەتە پاش ، ئڤجا دڤێت پشت نەدەبێ‌و بەرە بەرە نیشابدەی‌و تێ بگەهینی هەتا ژڤێ قوناغێ دەردچیت .

٤ بچویك و پاراستنا چارەکرنێ چێتر :

بچویکی ژبەرکو لەشەکێ نازك هەیە ، ئێش‌و نەخۆشی پشتی شەرەکێ کێم لگەل بەرگریا هەی بەسردا دێ زال بیت و ژهێز ئێخیت ، ئڤجا دڤێت دایك بڤێ چەندێ بزانیت بهەمی شیانێت خۆ بپارێزیت چونکە یا مە دڤێت و دلێ‌مە بێ پێ خۆش ئەوە کو بچویکێ مە بێ گرنژی‌و بۆشکۆری بیت ، ئاشکرایە دێ بێ هۆ بیت ئەگەر ! بێ بسەخبێرو ساخلەم بیت .

ئەگەر هەر کەسەك سەحکەتە خۆ دێ بینیت هێشتا بێ بچویك دوو تەرزێت ئێشا تێ د ئالهان :-

أ - ئەم دێ چێتر شێ‌ین بێژین ڤێ توخم نە سافی یان دەرد ، ئەڤە زۆر توخمێت تێك وەربووی دگریت بێت کو هەر ژبچویکاتی‌بێ هەڤالینی یا مرۆڤی دکەن‌و بزوری ژی لگەل مرۆڤی مەزن دبن ، یان دێ بچویك بن ، یان ژی بەرە بەرە بۆ نەمانێ ، ئەڤ رەنگێ ئێشا ژ دەست پێ‌کرنا ژینێ دزێن و ئەوژی بکارێ جهێ مرۆڤ تێدا دژیت یان مرۆڤێد دگەل رادین .

ئەڤان ئێشا کارەکێ ئێکجار خراب‌و کرێت لسەر تبعەت و پاشە روژا مرۆڤی هەیە ئو هەر ئەڤە قەدرو قیمەتێ بۆ مرۆڤی نەهێلن و خەلکێ ژخۆدانی درەڤینن ! ، پاشە روژا وی رەش دکەن .

ئەڤ ئێشەنە وەکی بچمەکێ نەبۆ شکۆری ، ئەنیەکا گرێ ، زك رەشی ، حەسویدی ، ترس پێ بێ باوەریا بخۆ ، لەقلە قووکی (دلواسواسی) . . .

چارەکرنا ڤان رەنگێد نەساخی‌بێ دمینیتە لسەر چوونیەتیا بخۆدا نکرنا بچویکی و رابوناوی ، هەلبەت ئەڤ تشتە نە لدەڤ دیار نابن ئەگەر دمالەکا تەناو بەختەوەر دژینەکا پر خۆشی و شادی ، دگەل دایك و بابێن بێێك خۆش‌و دل فرەهـ ، دگەل خەلك و هەڤالێن بتوورەو ئەدەب بژیت و رابیت .

ب - یا دووێ هەمی کول‌و ئێشێن دی دگریت ، بیێت کو هەردەم .

بچویك بۆی بەرهەڤە ، ئەڤە ژی خش تێدا نینە ژ خەم نەخوریا دایکێ‌بە ، ژبەرکو بچویك ئێخسیرێ دایکا خۆیەو هەردوو دەست و پێ دگرێ داینە و بەرێ لدل‌و دەستێن دایکێ ، لبەر گەرم‌و سەرمابێ بپارێزن ژئاڤ‌و ئاگرا دویر دانیت ، ئەڤنە ژێك وەکی زك ئێشان‌و ستورکاو خەندەکۆکی و سەر ئێشانێ و سۆتن و بریندار بوونێ . . .

بەلێ ئەڤە گەلە ئێشا دگریت بەلێ پێچە سەخبێری پێ دڤێت ، ئڤجا دا بهەمی شیان‌و زانینا خۆ دایکێ فێرکەین کادێ چەوا ڤێ بەرێ پیرۆز پارێزیت‌و راکەت .

٥ - بچویك‌و باوەریا بخۆ :-

بێ گۆمانە مەزن ترین رێك‌و ئەگەرا سەرکەفتن‌و پێشکەفتنێ باوەریەکا موکۆمە بخۆ ، هەرکەسەك دێ شێت ئەڤ خەسلەتە لدەڤ مەواندی بیت ئەگەر هەر ژبچویکاتی بێ لگەلخۆ هەلگرتبیت . . .

چەند خۆشە ئەگەر مرۆڤ دسەر هەمی ئاستەنگ و گرفتاریارا دەرباو ببیت ونەکەڤیت چو تەپکا ، هەردەم مرۆڤی سەر فەراز بیت . . .

دەیکا بهاگران ، بابێ خۆدان قەدر ئەگەر هەوە بڤێت عەیالێ‌وە هۆسا بژیت پێلن بلا بزڤیت ، بلڤیت ، باخڤیت ، بچیت ، بهێت ، خۆ تێ‌بگەهینیت ، هنربکەت ، باهەست پێ‌بکەت بلا دەرکەت ، لدویف بچیت و چیرکێش‌بیت ، دەنگێ خۆ بدەت ، هەرجار هەول بدەت ، باریا بکەت ، شەرمین نەمینیت . . .

هەلبەت ئەڤ هەمی تشتەنە دڤێت بچو رەنکا ژ توخوبێ ئو نابیت دناڤ خەلکیدا بچرسکینی و شەرماوی ببەیڤە ، چونکی هەتا هەتابێ دێ بیتە بزمار دینێ پێ ی را ، دڤێت پشتاوی بگری‌و هەر وەختێ بیێ رابوونەکێ لێ ، پێتێ بە دەستێ هاریکاریێ بۆدرێژکەی‌و پتر پالدەی دا بدەست ڤە بهێت ، هۆسا دێ باوەریا وی موکۆم‌بیت‌و ناپا شڤە هێت ، دێ بێ زیخ و چەلەنگ بیت .

ژبلی کو مال ، مەکتەبا بچویکی‌بەو لبەر دەستێ تە دایکا

عەزیز ، فێری هەمی تشتا دبیت ، بەلێ یاگۆتی (هەر تەیرەكو رەفا خۆ) ئێدی بچویك ژی هەرگاف پەرێت وی دقژن دا لگەل رەفا خۆ بفریت ، توژی هەرجار بەردە دابچیت ببینیت ، بزانیت ، تاما سەربەخۆیی بێ سەحکەت ، چستو چەلەنگ بیت . . . نابیت چو جار بێژێ وەرە دێ کەڤی دێ بچویك تە قوتن ، دێ بەرزە بی ، دێ . . . . .

بەلکو دڤێت هەر ناف تێبدەی و هشیارەکەی دابێ ژبەر خۆ هاتی یەدەرێ بیت و بێ زانا ورێبەر بیت .

ئەرێ چەند جار دبێین : خۆزی زویتر ئەڤا دزانین مەزاینبا ، خۆزی زویتر تێگەهەشتباین ، خۆزی زویتر باشی و خرابی مەژێك ڤەدەرکربان ، پاشە پا بۆی نابێین دا بچویکێد خۆ زوی ڤێرا بگەهینین ، ڤان هەمی چەقلکا ددە ستیدا نەشکێنین بەلێ ئەدبێم دڤێرێدا (ئەگەر ئەم گول نەبین بلا نەبین ستری) .

گەلە دایكو باب بدلەکێ نەرمو نەزان دێ بچویکێ خۆ نازدارو نازككەن ، هەتا دێ بێ دەستو پیکەن ! ، ئێدی ژ شیان و ژیانێ بێ بەهر کەن ئەڤە دێ باش خۆیا بیت دەمێ بقۆناغا مەکتەبێ (٦ سالی) را دگەهیت ، ئەو قۆناغا کو خۆنجۆ بژیت دپەروازێ سەربەستێ یەکێدا دبزڤیت ، پێتڤێ شیانەکا وەتۆف هەیە کو بەرەنگاری هەر گهۆ رینە کا ژینێ بیت ، لێ دسەر هندێرا دایك و باب (وەکی تبلا بپەلی ڤەمای) لێ دکەنو ژهەمی زخێ خلاس دکەن ، بچویکێ هۆ دێ بینی هەردەم بێ تێکوەر بوویەو شەرمین و نەبێ پیچیبوویە و بێ شۆرە ، بدامانگا دەیکا خۆڤە هەردەم بێ ڤە نویسیایە .

ئەڤێ چەندێ چەند ئەگەرێت ئاشکراهەنە :—

أ — شەرە نیخو ئالزیا لناڤبەرا دایك و بابا ، نە تەناهیو ترسیانەك ژ دۆژمنایەتیێ دێ پەیداپیت و کار لسەرکەت .

ب — پێڤە مەحتل بوونەکا زێدە ژتوخوییی ، بچویکی تویشی نەهاتیێ و کێم باوەری بێ دکەت .

ج — چاف دێری و پویتە پێکرنەکا ژ توخوییی دەرکەتی دبنە ئەگەرا تێکدانا ناڤ خۆیی و هەر ڤاندنا شیانێ .

ژبۆ پەیدا بوونا باوەریەکا بهێز لدەف بچویکی دابنێرینە ئەڤێدخارێ :—

أ — نەوەسا بنازینن و بدەللینین کو هەمی لڤینێد وی لسەر کیستێ مەبن .

ب — وەکی دکەڤیت ژێ بگەرهە دا ئەو بخۆ رابیت ڤە ، بلا تەپکانێ بکەت ، بلا رهێلیت هەڤالێ خۆ . . .

ج — یاریەکا وەسا نیشابدە کو بتنێ ئەو بخۆ تێدا بخەبتیت و شیانا خۆ بیناسیت .

د — ناف تێبدە ژبۆ پاراستن و گەش کرنا حەزلێکرنێت هەین .

هـ — بچو تەرزا بچویکێ خۆ نەسۆحرینەو دەقاوی نەشکێنە .

و — نە بسەرڤەو بساناهی دگەل رایەو بژنە ، یان ژگرفتاریێا برەڤینە ، بەرە بەرە فکویراتیێ ببە و چەوا دێ ژێرا بسەر کەڤیت .

## ٦ — ژین ژبچو یکاتی و هیڤی هێڤین :

بچویك بنیات و شەنگەستەیە . . . تورو گۆپیتکە . . . هیڤی و ئۆمێدا دۆهیيە . . . هۆستاو رێڤە بەرێ سۆبەهیيە . . . گرنژین وبۆشکۆرینا هەردەمە . . . هەرئێك بهێتە سەر دەپێ شانویا ژینێ ، کەلیڤەکا هەی بگریت و پێ رابوینەکا هەی رابیت پێ ، پێ نەڤێت ژ درێژیيا رۆژگاری دبارە هەرئێکێ بهێت دێ پەلەوانێ رستەکێ بیتو بەرەف پێشڤە دێ لسەر چیت .

ئەگەر سەحکەینە دیوارێ هیڤی یێد هەر ئێکی ژمە دێ بینین ژبچویکاتی بێ دهێتە نژیان و بەرێ ئێسیلەی دایك و باب بۆ ددانن ، بلا هەر کەسەك تەماشەی فەرهەنگا خۆشییێد خۆ بکەت یازێ دپە ژینتو ئەوە هەما هیڤی بدەستڤە دهێن . . .

خۆدانی بچویکی دشیانێ دایە ، کێلا ئارمانجانێ نێزیك بۆڤەدەت دا بسانەهی بهەنگێڤیت ، لیێشیێ بچویك پێتڤی مای ژێکرنەکا بەر فرەهـو مەزنە ، پاشی پێتڤی چست و چەلەنگی و هشیاریێ ، پاشی توورەو رەووشتەکێ هێژا ، پاش دگەل قۆناغێد پێشڤە چوونێ زانین و تێگە هەشتنەکا بنەجهـو موکۆم ، ئەڤەو هەتا بینی لپاشە رۆژێ شیرێ ژینێ مەبێیەو ژ ڤێتی بێ هیڤیيا دخۆت .

ژبلیکو دایك و بابا کارەکێ خۆسەر هەیە لسەر فرێئێخستنا کاروانێ ژینێ و کا چ بار بیت ؟ ! ، هەر وەکی مەتەل دبێت (کور) کڤانێ بابێ دکێشیت ، کچ تەشیا دابێ درێسیت) ، هۆسا دێ بینی کورێ بابێوی دارتاش ، دختۆر ، جوتیار . . . شۆلێ بابێ خۆ دبینیت و چاف لێ دکەت . . . ئۆ دیسا ئەندیازیاری دڤێت کورێ وی لهژمارێ بێ زیرەك بیت ، شۆفێری دڤێت کورێ وی ترومبێلێ بهاژووت ، دیسا دبینی کچا دایکاوێ

ماموّستا بيت هەردەم لپێشيا هەڤالێن خوّ ماموّستايە . . . ! .
بەلیٚ براستى ئەڤ هەمى چەندە قەت ژبوّ چەڤينا رهـو ريشالێن حەزلیٚ کرنا براستو بخوّیی نابنە تەحتو نامرینن ، هەتا ئەگەر بزورى ژىبينى لیٚ ژبوّ ڤیٚ خوزى بیٚ هەلبەت پالدانا ڤەرەو ناڤ تیٚدانا پێتڤى .

ئاشکرایە لدەڤ هەر ئێکى ژبچويکاتى وەرە حەژێکرن هەنەو پێکڤە دهێنە پالدان ، هەرچەند زوّرجار مروّڤ پیٚ ناحەسیتو لگەل بەرەڤخوّکرنیٚ دبينى تویٚ ڤێرا گەهەشتىو تیٚدا دژى ئوّ ئەوا زانایە ژسەحکرنو لدويڤ چوونێن زانايێد دەروونى بەهرا پتر .
ژ هێڤيا بدەست ڤە دهێن ئەگەر ئەختيارى و رشتى لسەر هەبيت ، ئو ئەڤێ وەريسى دوو هێز رادکێشن : ئێك – بزاڤـو لڤينا بچويکى . دوو – هاريکارى و پالدانا دایو بابا و (رێڤە بەرێددى) .
بەلیٚ ئەڤێ کاریٚ دوویێ ئاگە هدارىو هشيارى يەکا چاك پیٚ دڤێت ، چونکى گەلە جارا ئەڤ چويڤدەستەنە نزانن بڤى دەورى رابين ، يان دیٚ دسەر ڤيچێدا بەنە خاریٚ و لدويڤ وەکى وان دڤێت پالدە ، بەلیٚ ئەگەر هوّ لیٚبهێت دیٚ چەوا بيت ؟ . ئەڤێ پسيارێ بەرسڤ لدەڤ هەر ئێکى ژمە هەیە ، لیٚ ماموّستا (دين هومل) دگوّتارا خوّدا (کەسپا عەيالى !) دبێت : لدويڤ نێرين و تیٚ بينێت من دکوّمەلیٚ زانکوّيێدا ژبيست سالا وەرە ، ٣٠٪ ژگەنجێد خوّ بزانکوّيا رادگەهينن لدويڤ ڤيانا بابێيە ئو ئەڤێ ژى چو قازانجا خوّ نينە . گەلەجار لدويڤ ڤيانا بابێ راستىيەکا ئاشکرا دگەهينيت بەلیٚ ئەڤە ژچەند لاياڤە دبيتە سەرگێژىو وەستيان ژبوّ پێشکەفتنیٚ .
ئو هەروەسا ١٠٪–١٥٪ ژبالا بکاریٚ خوّ نەدخوّشن چونکى ، لدويڤ ڤيانا خوّ پیٚ نەگەهەشتنە . پشتى هينگیٚ دبێت :
لسەر دايك و بابا پێتڤىيە کێماسىیێ نەکەن دپالدانا بچويکیٚ خوّ لهەر کاریٚ بوّ بزڤن ئو دڤێت لسەر رێکێت راستو دروست هەڤرکىیێ دڤى شوّليدا پەيداکەن داکو هێشتا لسەر مجدو مسوّگەر بن ، هەتا ئەگەر ئەڤیٚ درێژ ڤە کێشاژى . . ماموّستا هوّمل پێڤە دچيتو دبێژيت : کچا من ژکوّليجا حقوقیٚ دەرچوو ئو دکتوّرا بفەلسەفیٚ وەرگرت جارەکیٚ من گوّتیٚ : هژمارەکا بوّش ژپارێزەرا برەنج و ژارى دژين . . . ئينا لمن ڤەداو گوّت : باب کێم ژوان ژنن ! .
ئها هوّسا دڤێت خودان بشێت کاریٚ ڤیایو بدەست ڤەهاتى بەرەڤانىیێ ژیٚ بکەتەو بيرو باوەرێد خوّ تیٚدا موکوّم کەت داکو هەردەم بیٚ بسەرکەفتى بيت .
زوّر جار دبينين کو چەند تشت ڤبانا مروّڤ دکێشن ، ئەگەر هوّ لیٚهات ، بلا لگەل هەميا خوّ بهەلاڤێژيت هەتا ئێك د سەردازالیٚ دبيتو ژ هەلبژارتيابيت ، ديسا جارەدى نەبزوّرى بيتو سەر لیٚ ئێك بچيت وەکى دبێن (کێم بدە بەر دەڤیٚ داسا خوّ) . چوّنکى بابەکى دڤيا دسەر حەزلیٚ کرنێد ویٚ کچاوى ڤێرى موّسيقیٚ ژى ببيت ، ئينا روّژەکیٚ گوّتیٚ : کچا من ! چەند تە ببينم دەنگەکیٚ ئاوازى لیٚ ددەى دیٚ پێنج دەرهەما دەمەتە .
کچکیٚ بجێبەتيڤە بەرێخوّ دا بابیٚ خوّ و گوّتیٚ : تەژبەرچىيە باب ؟ مامن چ دڤێت ؟ تو دزانى چەند ئەز جارەکى نەدەم جيرانیٚ مە نيڤ دينارێ ددەتە من ! .
مەتەلەکا ئنگليزى ژى لسەر ڤیٚ چەندیٚ دبێت (دیٚ شیٚى هەسپى بەيە سەر ئاڤیٚ ، بەلیٚ نەشیٚى ڤرەکا ئاڤیٚ بزورى بدەیێ) .

ئەڤەو هێڤى دارين دايك و باب ئەڤى باریٚ نازكو
شکەستووك ساخ بگەهينن ژبەر کو ئەون
بارگرانێد پاشە روّژیٚ .

صديق خالد هرورى

**ئێهن شکاندنەك ژ ڤان سەروکانيانە :**


١ – (كيف تربين أولادك) دارالمعرفة ، محمد رفعت .
٢ – (الأم والطفل) جمعية الهلال الأحمر العراقية / العدد ٤٠٨
٣ – مجلة (طبيبك) العدد ٢٩١
٤ – مجلة (الدستور) العدد ٢٢٦ – ٢٢٨
٥ – مجلة (الدوحة) القطرية العدد ٧٥

# کورتە هەڵسەنگاندنێکی پرۆگرامی خوێندنی ڕێزمانی کوردی لە قۆناغەکانی ناوەندی ئامادەیی دا»

محمد احمد سعید

زمانو ئەدەبی کوردی . بۆپۆلی یەکەمی ناوەندی چاپی حەوتەم چاپخانەی وەزاراتی پەروەردەی ژمارە «۲» هەولێر ، ڕێزمانەکەی لە حەڤدە وانە پێك هاتووە سەرەتا بە بابەتی ڕستەو گرێ دەست پی‌کراوە بە دوایدا شێوەکانی وشە . . . لەوانەی سێ‌یەمدا دێتە سەر برگەکانی وشە . ئەگەر بەشێوەیەکی زانستی قوتابی فێری ڕێزمان بکەین ئەوا دەبێ لە بچوکترین دانە (وحدە)وە دەست پی‌بکەین بۆ ئەوەی لە پێشدا قوتابی بەو دانە بچوکانە ڕابهێنین لە دواتر بۆ نەیەکی ترو گەورە تر نە دەبوو لە کتێبەکەدا بە ڕستەو گرێ چاوی قوتابی لەو بارەوە بکرێتەوە بەڵکو چاکتر وابوو لە پیتو دەنگ‌و گرێ‌یەوە بەشێوەیەکی ڕیزکراو لە بچوکەوە بۆگەورە دەست پی‌بکرایە جاری با قوتابی فێری پیتو ناسینی دەنگەکانی زمان بێ بە دوایدا بۆ دانەیەکی‌تر کە ئەویشی وشە بێ . کە چی باسی پیتەکانی وشە لەوانەی چوارەمدایە . باشتر وایە کە ئەم چوار وانەیە لە کتێبەکەدا بەم شێوەیە باس بکرێن .

وانەی یەکەم : پیت

وانەی دووەم : برگە

وانەی سێ‌یەم · وشیە

وانەی چوارەم : گرێ‌و ڕستە

بێجگە لەمەش لە (بە کورتی) وانەی دووەمدا (شێوەکانی وشە) پێناسی وشەی سادە بەم جۆرە کراوە « وشەی سادە گوتراوێکە لە چەند دەنگێك بە شێوەیەکی تایبەتی خراونەتە پاڵ یەك شێوەیەکی ساکارو گوزارەیەکی هەیە پێك دێن[۳] لە خوێندنەوەی ئەم پەرەگراڤەدا قوتابی ئەگەر زۆر بە وردی نەچێتە ناخی‌یەوە لی‌ی تی‌ناگات چونکە لە وشەی سادە دەدوێ پاشان لقێکی تری دەبێتەوەو دەیترازێنێتە خوێندنەوەی ڕستەکانی ترەوە لە پڕ لە کۆتایی‌دا کرداری «پێك‌دێت» دێتە ناوانەوە . پێناسەکە بەم جۆرە بێ باشترو لەبارترە .

«وشەی سادە ئەو گوتراوەیە کە لە چەند دەنگێك پێك‌دێت‌و بە شێوەیەکی تایبەتی خراونەتە پاڵ یەك شێوەیەکی ساکارو گوزارەیەکی هەیە ، وەهەروەها «وشەی دارژاو» بە کارهێنراوە[٤] دارژاو ئەو مەبەستە ناپێکێ کە لە پێناسەکەدا هەیە . دەبوایە « داریژراو» یان ئاڵۆز بەکاربهێنرایە .

چونکە داریژراو بە مانای دروست‌کردن یان دارشتن وەخۆی هەر لە دارشتنەوە وەرگیراوە . لە وانەکانی دوانزەهەم‌و چواردەهەمدا[٥] لە ڕاناو دەدوێ شێوەکانی ڕاناو دەیانکاتە دو بەشەوە ڕاناوی کەسی سەربەخۆو ڕاناوی کەسی لکاو ئەویشیان لە دوو شێوەدا باس دەکات کتێبەکە هەر شوێنی ئەو بیرە کەوتووە بۆ بەکارهێنانی وشەی «ڕاناو» لە بری «ضمیر»ی عەرەبی (Pronoum) ئینگلیزی ئەگەر ئێمە هەر لە پێناسەکەی خۆی بکۆڵینەوە ئەوا وشەی ڕاناو واتاکوردی‌یەکەی لای خۆمان ناپێکێ لە وشەی ڕاناو بکۆڵینەوە دەبینین وشەیەکی لێکدراوە لە ڕا + ناو ڕاناو پێك‌هاتووە وشەی «ڕا» لە کوردی باشوری‌و دیالیکتی هەورامیدا بە مانای «ڕێ .ڕێگا» هاتووە وەها کەمەولەوی دەڵێ

ئاخر سەفەرەت ڕاخەیڵی دوورەن

مەنزڵ بێ پایان تۆشە زەرورەن[٦]

دەبوا سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشرابایە ئەمن وای بۆ دەچم دەبوا نە بری‌و شەی «ڕاناو» کە جێناو « یان» « بەرناف » بەکاربهێنرێ باشتریش وایە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن ئەو وشەیە دابنرێ چونکە وشەی « جێ » لەبارترە وەك لە ۱ وەقوتابی گوی‌ی بە جێ ئاشناترە لە «ڕا» ئەوجا دەڵێین جێناو : وشەیە جی‌ی ناوێ مان جێناوێ دەگرێتەوە .

| راناو | کەسی یەکەم | | کەسی دووەم | | کەسی سێیەم | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| راناوی کەسی سەربەخۆ | ناك<br>من | کۆ<br>ئێمە | ناك<br>تۆ | کۆ<br>ئێوە | ناك<br>ئەو | کۆ<br>ئەوان |
| راناوی کەسی لکاوم | م | ین | یت | ن | ت<br>ێن | ات [1] |

لەم خشتەیەدا هەندێ هەڵە بەرچاو دەکەوێ ئەگەر بێت کردارەکانی بە سەردا گەردان بکەین بەم جۆرە .

کردارێکی رانەبردووی تێپەر کوشتن / ،/ بردن ، کرداری ، تێپەری ، رانەبردو

| ناك | کۆ | دەبەم |
|---|---|---|
| دەکوژم | ئەکوژین | دەبەی |
| دەکوژین | دەکوژن | دەبات |
| دەکوژین | دەکوژن | |

کردارێکی رانەبردوی تێنەپەر :

| ناك | کۆ |
|---|---|
| دەمرم | دەمرین |
| دەمرێت | دەمرن |
| دەمرێن | دەمرن |

دەبێ جێناوی کەسی سێیەمی کۆ لە ژێر ستونی «کۆ» دابێ نەك تاك ئەمەش لە خوێندنەوەو پیاچونەوەدا سەر لە قوتابی دەشێوێنێ وەهەر وەها دەبوایە کردارێکی دەست نیشان بکردایە بۆ ئەو مەبەستە چونکە ئەو دوو خشتەیەی کە بو ئەو مەبەستە بەکارهێناوە وەنەبێ بڵێین لە جێی خۆیدا نەبووبێ . . .

چاکتروابوو ئەو جێناوانەی کە لە کرداری تێپەردان لە رابردوو رانەبردووبانەوە لە خشتەیەکی تایبەتی دابێ .هەر وەها بۆ کرداره تێپەرەکانیش بە هەمان شێوە وەك ئەم خشتانە .

خشتەیك بۆ ئەو جێناوانەی کە بە کرداری تێنەپەرەوە دەلکێن کردار / چاوگی « مردن »

| جێناو | کەسی یەکەم | | کەسی دووەم | | کەسی سێیەم | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| سەربەخۆکان | ناك<br>من | کۆ<br>ئێمە | ناك<br>تۆ | کۆ<br>ئێوە | ناك<br>ئەو | کۆ<br>ئەوان |
| لکاوەکان لە رانەبردودا | ناك<br>دەمرم | کۆ<br>دەمرین | ناك<br>دەمرێ‌ین | کۆ<br>دەمرن | ناك<br>دەمرێ—ت | کۆ<br>دەمرت |
| لەرابردودا | مردم | مردین | مردین<br>مردین | مردن | مرد٪ | مردن |

دەینین لە کەسی سێیەمی تاك جێناوەکە دیار نی یە وەك لە مرد /دا ئەمەش لە هیچ کام خشتەکاندا نەنوسراوەو نەباسیش کراوە .

خشتەیەکی تر بۆ ئەو جێناوانەی کە بە کرداری تێپەرەوە دەلکێن کردار چاوگی « بردن » :—

| کەسەکان | کەسی یەکەم | | کەسی دووەم | | کەسی سێیەم | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| جێناوە لکاوەکان بۆرانەبردو | ناك<br>دەبەم | کۆ<br>دەبەین | ناك<br>دەبەی<br>دەبەین | کۆ<br>دەبەن | ناك<br>دەبات<br>دەکوژێ | کۆ<br>دەبەن<br>ـت |
| جێناو دکاوەکان بۆ رابردوو | ناك<br>بردم | کۆ<br>بردمان | ناك<br>بردت | کۆ<br>بردتان | ناك<br>بردی | کۆ<br>بردیان |

لێرەدا کەسی سێیەمی تاك لەهەندێ کرداردا دەبینین جێناوەکە دەگۆرێ بۆ « ات » «ا» وەك « دەبات ، دەبا ، دەدات ، دەدا . ئەروات ، ئەروا لە کرداری تێپەرو تێنەپەردا ئەمەش خاسیەتێکی دەنگیی زمانە هەندێ جار دوبزوێن لە یەك دەدەن یان یەکێکیان تێ دەچێ یاخود دەگۆرێ بۆ شێوەیەکی تر. وەك لەم نموونەیەدا .

رۆیشتن / کردارێکی رانەبردوو

نیشانەی رانەبردوو + رەگی کردار + جێناوی کەسی سێیەمی تاك

دە + رۆ + ات دەروات گۆراوە

بە نیمچە بزوێن . لە نوسینی تیپی عەرەبی دیار نابێ ئەگەر بەلاتینی بنوسرێ ئەوا بە ئاشکرا دیارە وەك

DE + RŌ + AT DER WAT

وەیاخود تێدەچێ وەك

دە + بە + ات دەبات

وەهەر لە هەمان لاپەرەدا نوسراوە :

بەلأم ئەگەر گومانێك لە نێوان راناوی لکاوی کەسی دووەمو سێیەمی کۆرا کە (ن) گومانێك لەناو رستەکەدا پەیدا ببێت ئەو پێویستە راناوە سەربەخۆکانیان لەناو ئەو جۆرە رستانەدا بەکاربهێنین . چونکە ئەگەر بلێین « دوێنێ » چون بۆ زاخۆ» لەم رستەیەدا بە تەواوی ئاشکرا نی یە کێیە چووە ؟ ئێوە چون ؟ یان ئەوان چوون ؟ لەبەر ئەمە پیویستە لەم جۆرە رستانەدا راناوە سەربەخوکەیان ئاشکرا بکرێت ئەم حالەتەش سەربارەت بە نوسینەوە دەتوانین بۆ پرسیارکردن نیشانەی پرس( ؟) دابنین وەلە ئاخاوتنیشدا بە هۆی سترێشەوە (stress) (هێز)ە چ بۆ گەیاندنی هەوالێك چ بۆ پرسیار یکردنی دەرئەخرێ بۆ نمونە بۆ پرسیارکردن چوون بۆ دهۆك ؟ هێز دەکەوێتە سەر دەنگی « چ »وو .

چوون بۆ دهۆك . هێز نی یە .

لە لاپەرە (٦٨)داو لاپەرەکانی ئاوەڵناوی چۆنیدا لە رستەکانو لێکدانەوەیاندا تەنها باسی چونیەتی پلەی بەراوردو بالاو نیشانەکانی تر ، ترین (هەرە)ی لە کرمانجی خوارو کردووە بە بێ ئەوەی ئیشارەت بکرابایە بۆ ئەو ریگایانەی کە لە کرمانجی ژووروودا هەن ئەممەش من بەکەمو کورتی دەزانم چونکە ئەگەر مەبەستمان بەکگرتنی زمانی کوردی بێ

دەبوایە لە پاڵ لە – «ژ»ش بەکاربهاتایە بە تایبەتی لە پلەی بەراورددا وەنمونەش بهاتایەوە وەك

ئەوژنە زەریف ترە .

وەبۆ پلەی بالأش . و بەکارهێنانی « هەرە » بۆ بێنەی تاك ئاغا هەرە سار «هەری» بۆ نیرینەی تاك . گوندی هەری دوور ، وەهەر وەها لاپ زۆر جار بۆمێینەو نێرینەی تاك .

**لاپە بۆ مێینەی تاك**

**لاپی بۆ نێرینەی تاك**

**وە وشەی تەورە بۆ مێینەی تاك[9]**

**تەورێ بۆ نێرینەی تاك .**

لەوانەی حەڤدەهەمدا لە بارەی دەمەکانی فرمانەوە « فرمانی رابردوو» دەدوێ هەر چوار بەشەکەی جودا کراوەتەوە رابردوی روت ، تەواو ، بەردەوام ، دوور لە لاپەرە «٧٨» خشتەیەکی چەوتو چەوێك کراوە کە بە هیچ جۆرێ قوتابی ناگەیەنێتە ئەو مەبەستەی کە ڕێزمان خۆی دەیەوێ واخشتەکەش دەقاو دەق وێنەی دەکێشینەوە[10]

| دەمەکان | پێشگر | فرمان | پاشگر |
|---|---|---|---|
| رابردووی روون | — | هات | — |
| رابردووی نمواو | — | هات | ووە [4] |
| رابردووی بەردەوام | دە | هات | |
| رابردووی دوور | — | هات | بوو [5] |

ئەگەر بێتو ئێمە بە تێروانێکی راستەقینەو زمانەوانی یەوە لەم خشتەیە بکۆڵینەوە دەردەکەوێ کە ئەم هەلأنەی تێدایە .

١ – لە بری نیشانەکان پاشگرو پێشگر بەکارهێنراوە وەك نیشانەی رانەبردووی «دە»ی خستووەتە ناو خانەی پێشگرەوە وەهەر وەها جێ ناوی کەسی سێیەمی تاکی «ە» و کرداری بێ هێزی « بوو »ی خستوەتە ژێر خانەی پاشگرەوە .

فرمان کردار

٢ – لە بری قەدی کردار فرمانی نوسی وە

بۆ راست کردنەوەی خشتەکەش ئەم رێگایە پێشنیاز دەکەم بۆ کرداوی تێ نەپەر

| دەمەکانی کرداری رابردوو | نیشانە | قەدی کردار | Uوو | کرداری لێ هیزی بوو | جێ نادی دکـ |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | م/ی/ : |
| رابردوی سادە | | چوو | | | م . ی . وە |
| رابردووی نزیك | | چوو | Uوو | | |
| رابردووی دوور | | چوو | | بوو | م . ی . : |
| رابردوی بەردەوامی | دە | چوو | | | م ، ی : |

| دمەکانی کرداری رابردوو | نیشانەی رانەبردوو | جیناوی لکاو | قەد | U | کرداری بوو | جیناوو | ( |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سادە | | | برد | | | م | |
| نزیك | | | برد | U وو | | م | ە |
| دوور | | | برد | | بوو | م | |
| بەردەوام | دە | م | برد | | | | |

بۆ ئەم دو خشتەیەش دەتوانین لە خانەی جێناوەکاندا هەموو جێناوە لکاوەکان بە تاكو کۆیانەوە لەگەڵ کردارەکان گەردان بکەینو هەموو دەمەکان رابردوومان دەست بکەوێ .

**کورتە هەڵسەنگاندنێکی ڕیزمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی چاپی حەوتەم ١٩٨١ چاپخانەی پەروەردەی ژمارە (٢) هەولێر**

**بۆکرداری تیپەر تەنهانۆ کەس یەکەمی تاك**

ڕێزمانەکەی لە شانزە وانە پێك هاتووە لەم قۆناغەدا دیسانەوە کەوتۆتە هەمان هەتەوە لە پێشدا لە ڕستە کوڵراوەتەوە[١١] دوا بە دوای ئەودا باسی گرێ کراوە . ڕاستی دەبوایە گرێ پێش بخرایە جگەلەمەش لە باسی ڕستەدا بە پێ ی ناوەرۆك کراوەتە چوار بەشەوە بەم پێ یە لێ ی کۆڵراوەتەوە .

١ ڕستەی ڕاگەیاندن ٢ ڕستەی ڕاگەیاندن بە دوو لق
أ – ئەرێ ب – نەرێ
٣ ڕستەی پرس ٤ ڕستەی تەعەجووب . سەرسورمان .

لە ڕاستیدا ڕستە بە پێ ی ناوەرۆك دەکرێ بە سێ بەشەوە ڕاگەیاندن ، پرس ، سەرسورمان . لەوانەی حەوتەمدا باسی ناوی تاكو کۆ کراوە[١٢] کۆمەڵێ نمونە هێنراوەتەوە لەو خونانە تەنها باسی نیشانەی «ان»(AN) کراوە وەلە پەراوێزی هەمان لاپەرەدا نیشانەکانی کۆی وەك گەل gel ، هات Hat ، یت et ، ید cd هێنراونەتە ناوانەوە وە بە ئامراز دراونەتە نوسین ئەمەش لەگەڵ واقیعو لێکۆڵینەوەی زماندا ناگونجێ چونکە ئامراز بۆ مەبەستێك بەکار دەبرێو نیشانەش مەبەستێکی دیکە دەپێکێو ئەرکو شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە دەبوایە بۆ ئەو نیشانانەش نمونەی تر بهێنرا بایەتەوە چونکە لێکۆڵینەوەکەی فراوان تر دەکرد نمونەکانیش بەم جۆرە

| | |
|---|---|
| **گەل –** | **لە کورگەلدا** |
| **ەها –** | **لە هەزارەها ئەمەیان زۆرتر دەچێتە سەر ناوی ژمارە** |
| **ساڵ –** | **ساڵەها . ساڵها** |
| **چەند –** | **چەندەها** |
| **هات –** | **لە وشەی دێهات دیهات .** |
| **ات –** | **لە وشەی باخاتدا .** |
| **جات –** | **لە وشەی میوەجاتدا** |

وەنیشانەکانی کۆی «یت ،ید ، ئەمانە لە کرمانجی سەرودا لە حاڵەتی ئیزافەدا بەکار دەهێنرێ وەك . کورێت مە ، کورێد مە .

جگە لەمانەش هەندێ سەرنجی تر هەیە کە هەر بە تەمو مژی ماوەتەوە وەیا خود بە تەنها بە دوو وشە کۆتایی پێ هێنراوە وەك[١] لە بەشی سێ یەمی لق (أ)دانوسراوە بەڵام ئەگەر وشەیەك بە پیتی بزوێنی (ە) دوایی بێت لە کۆکردنەوەدا ئەم بزوێنە کورتە (ە) e شوێنی خۆی بۆ بزوێنی (ان) (AN) ەکە بە جێ دەهێڵێت . . . ئێمەش لێرەدا دەڵێن بۆ؟ خۆ دەبێ ئەوە ڕون بکرێتەوە کە دوو بزوێن هەمیشە لە پاڵ یەکتردا نایەن ئەمەش تایبەتی یەکی فۆنەتیکیو برگەیی زمانەکەمانە جا لەوێدا یەکیان تێ دەچێ .

(٢) لە لقی (ب)دا وەلە (بەکورتی)دا هەمان هەڵە دووبارە بۆتەوە لەبری دەنگیو (w) نیمچە بزوتین Simivowel پیتی نەبزوێن بەکارهێنراوە[١٣] . لەوانەی هەشتەمداو لەبەشی ناوی ناسراوو نەناسراودا لە هەندێ شوێنی باسەکەدا ئەم کەمو کورتی یە بەرچاو دەکەوێ دوو جۆر نیشانەی ناسین باس کراوە کە چی ئەو نیشانەی هەر ەکە (eke) یە نەك «کە – Ke[١٤] ئەو ناوانەی کە کۆتایی یان بەبزوێن دێت وەك .

| | |
|---|---|
| **مامۆستا + ەکە –** | **مامۆستاکە** |
| **پەنجەرە + + ەکە –** | **پەنجەرەکە** |
| **هەرمێ + ەکە –** | **هەرمێکە** |
| **چرۆ + ەکە –** | **چرۆکە** |

لەبەر ئەوەی کە دوو بزوێن بە دووی یەکدا نایەن وەئەگەر هاتن ئەوا یان یەکێکیان تێ دەچێ وەکو نمونەکانی سەرەوە وەیاخود دەنگێکی نیمچە بزوێن دەچێتە نێوانیانەوە

| | |
|---|---|
| **جۆ+ەکە –** | **جۆیەکە** |
| **ئوردوو + ەکە –** | **ئوردووەکە** |

| | |
|---|---|
| **CO + eke –** | **Coyeke** |
| **urdu +eke –** | **urduweke** |

کەمو کورتی یەکی بابەتەکە ئەوەیە کە بە هیچ جۆرێ باسی نیشانەی نەناسینی ی «ی» (e) ێك ek یەك yek ەك ek نەکراوە وەکو پاشگر باس کراوە نوسراوە پاشگری « ێك ، یەك» لە دوای

ناوەوە دێتو ناوەکە دەکات بە تاکی نەناسراو[١٥] لە راستیدا ئەمانە نیشانەن نەك پاشگر وەچیاوازی‌یەکی زۆریشیان لە نێوان داهەیە ئەگەر پاشگر بچێتە سەر ووشە لە رووی ماناو دارشتنەوە دەیگۆرێ بەلاّم نیشانە نایگۆرێ دەبوایە ئەم جۆرە نمونانە بەکاربهێنرابایە وەك .

ێ – **کورێ Kurê**
یك – **کورێك Kurek**
یەك – **قوتابیەك qutabiyek**
ەك – **لاڤەك Lavek ئەمیان لە کرمانجی سەروو شێوەزاری سۆران بە کاردێ .**

لەوانەی یانزەهەمەداو لە باسی ئاوەڵفرماندا چوار نمونە هێنراوەتەوە لە رستەی دووەمیاندا «دەرسەکەمان خێرا تەواو بوو»[٦] لە روون کردنەوەکەیدا نوسراوە لە رستەی دوەمدا ویستمان ئەندازەی ئەو « تەواو بوو» نە دەربخەین لەبەر ئەمە پەنامان بردە سەر وشەی « خێرا» بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستەو بە هۆی ئەوەوە سنورێکمان بۆ واناى فرمانەکە دانا لێرەدا بە تەواوی مانای « خێرا » رون نەکراوەتەوە ئەم وشەیەش چەند واتایەکی هەیە وەك : خێرا . ئاوەڵناوە . خێرا . خێراتر . خێراترین ئاوەڵناوی چۆنی‌یە وەکو ئاوەڵفرمانێکیش حسێب دەکرێ چونکە سنورێك بۆ چۆنیەتی روودانی کردارەکە دەست‌نیشان دەکات کە دەڵێین «دەرسکەم خێرا تەواو کرد» مانای ئەوەیە کە بە خێرایی دەرسەکە تەواوکراوە لێرەدا چۆنیەتی روودانی کرداری « تەواوکرد » دەستنیشان دەکات .

لەوانەی چواردەهەمەداو لە باسی ئاوەڵناوی نیشانەدا[١٧] باسی ئەم دو ئاوەڵناوە کراوە .

ئەم . . . . ە

ئەو . . . . ە)وەکو ئاوەڵناو دراونەتە نوسین . ئەگەر لێیان ورد بینەوە دەردەکەوێ کە سیفەتی ئاوەڵناوییان تێدا نی‌یە بەڵکو بۆ دەستنیشان کرد نەکار دەبرێن چ بۆ نزیك چ بۆ دوور بێ . . . دەبوایە لە پاڵ ئەوەشدا ئەم باسە بهاتبایە ناوانەوە . وەهەر لە پێناسەکەشدا نوسراوە : ئاوەڵناوی نیشانە ئەوەیە کە بۆ وەسفی ناوێ یان راناوێ یا کەسێك یان شتێكو جیاکردنەوەی لە ناو هاوچەشنەکانی خۆی‌دا ناوەکە دەستنیشان دەکەنو ناوە دەستنیشان کراوەکە دەگرنە بەبنی خۆیانەوە[١٨] لێرەدا نیشانەکان وەسفی ناوەکان ناکەن ئەو وەسف کردنەش کە لە نمونەکاندا هەن وەك :

«ئەم گوڵە جوانەو ئەو گوڵە وشك بووە» بەهوی ئاوەڵناوەکانی (جوان) و (وشك) ەوەن

مەبەست لەم ئامرازانە تەنها بۆ جیاکردنەوەو دەستنیشان کردنە دوور بێ یاخود نزیك لە لاپەرە (٤٤ راهێنانی (٥) کرداری تێ‌پەرو تێ‌نەپەر کەرستەیەکی شی‌کراوەیە « گۆرانی‌یەکەمان بیست»

گۆرانی‌یەکە ، ناوە ، ناسراوە ، دولایەنە ، سادەیە ، تەواوکەری راستەوخۆی فرمانی‌بیستە ئەگەر سەیری ناوی وشەی گۆرانی بکەین کێ دەڵێ دولایەنە . ئەگەر دو لایەن بێ ئەوا دەبێ هەم نێر بێ‌و هەم مێ بێ .

گورانی سەر بە هیچ رەگەزێکیان نی‌یە بەڵکو ناوێکی بێ لایەنە . . .

## کورتە هەڵسەنگاندنێکی . . . .
## زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێ‌یەمی ناوەندی
## چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی ژمارە (٢) هەولێر ١٩٨٠

رێزمانەکەی لە سیانزەیەکە پێك‌هاتووە کە لە دوو توێ‌ی (٧٧) لاپەرەدا خۆی دەنوێنێ لەلایەن لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردەوە دانراوە . لەم قۆناغەدا زۆرترین بەشەکانی ئاخاوتنی تێدا باس‌کراوە وەك ناو لە روی رەگەزەوە لە روی دارشتنەوە ، راناوی پرس ، ئاوڵناوی پرس ، چاوگ کردارو رەگی کردار و ئامرازی پێوەندی دەبینین لە ریزکردنی بابەتەکان چەند کەمو کورتی‌یەکی تێدایە بۆ نموونە لە یەکەم وانەدا لاپەرە (٩) لە رستەی لێکداراو دەدوێ دوا بە دوای ئەودا بۆ گرێ‌و ئەو جار بەشەکانی ئاخاوتن ئەمەش هەر وەك لە سەرنجەکانی تری قۆناغی یەك‌و دوو لێوەی باسمان کردووە کە دەبێ لە بچوکترین دانەوە بۆ گەورە بچین بەرای من دەبوایە لە پێشدا لە بەشەکانی ئاخاوتن باس بکرێ بەدوایدا بۆ گرێ‌و رستە . . .تاد .

لەوانەی سێ‌یەمداو لەلەپەرە (٢٠)دا لە بارەی[١٩] « ناو بە پی‌ی جنس»ەوە باس کراوە لێدوانە کە بە شێوەیەکی زانستی نی‌یە چونکە لە ناوی دو لایەن‌دا جۆری دەستنیشان کردنی بە شێوەیەکی وا نی‌یە کە شیاوی باس بێت . وەهەر وەها لە دروست کردنی‌دا نوسراوە هەندێ گیاندار هەیە دەتوانرێ مێیان بە پێشگری «ما» وەنێریان پێشگری «نێر» دەستنیشان کرێت وەك :

(کەو –        ماکەو ، نێرەکەو

دەمەوێ ئەوە روون بکەمەوە کە هەر دو وشەی « ماەنێر » پێشگر نین بەڵکو وشەی سادەی واتادارن پێشگر واتای تەواوی نی‌یە جگە لەمەش مەرج نی‌یە هەر بچینە پێش ناوەکەوە بەڵکو زۆر جاران دەچنە دوای ناوەکەوە بە هۆی ئەنتەرفێکسی (ە)ەوە .

گیسك –       گیسکەمێ ،گیسکەنێر
بەرخ –       بەرخەمێ ، بەرخەنێر

وەهەندێ رێگای تریش هەیە بۆ دیاری کردنی رەگەزەکانی ناو وەك :

سەگ –   بۆنێر–   گۆلە –   سەگ .گەماڵ
بۆمێ –   دێڵسەسەگ .دەڵ

لە دەستنیشان کردنی رەگەزی هەندێ گیانەوە – وئاژەڵ هەر بە هۆی ئەنتەرفێکسەوە دەکرێ وەك هەموو قۆناغەکانی تەمەنیان تا کامڵ بوون یان

بەرخ –   بەرخە نێر ،بەرخە مێ
کاور –   کاورە نێر : کاورە مێ
(شەك –   شەکە نێر ،شەکە مێ .

دووا قۆناغیش مەر بومێ بەران بۆ نێر

کار –   کارە نێر ، کارەمێ
چتێر –   چتێرە نێر ، چتێرەمێ
بزن بۆ مێ . سابرێن بۆ نێری بۆ نێر

دەبوایە بەم تێبینیانە رەچاو بکرابایە .
لەوانەی چوارەمدا باسی « دارشتنی ناو »[٢٠] ئەم باسەی لە بارەی پێکهاتنی ناووەیە دابەش کردنەکەی بەم جۆرەیە . ناوی سادە ،ناوی دارڕاو ، ناوی لێکدراو دەبوایە دابەش کردنەکەی لەم شێوەیەدا بودایە . وابێت باشترو رێکو پێك‌ترە ناو لە رویپێك هاتنەوە دەکرێ بە دو بەشەوە سادەو ناسادە نا سادەش دەکرێ بە دوو بەشەوە ناوی لێکداراوو دارێژراو . .

وەلە پێناسەکردنی ناوی لێکدراودا نوسراوە ئەو ناوەیە کە لە دوو وشەی سادەی واتادار یا پتر پێك دێت بە یاریدەی ئامرازی پێوەندی «ە» یا بێ یاریدە دەدوێتە پاڵ یەکتر وەك گەڵاتوو ، مێرگە سور[٢١] لەم پێناسەیەدا سەرنج بۆ دووشت رادەکێشین راست بکرێنەوە باشترە .

١ – لە ناوی لێکدراودا ئامرازی پێوەندی دەور نابینێ وەناتوانین (ە) بە ئامرازی بدەینە قەڵەم بەڵکو ئامرازی لێك دەرەو دوو وشە لە یەك دەدا .

٢ – لە دوو نمونەکەی کۆتایی گەڵاتو مێرگە سور دا هەردویان ئەو مەبەستە ناگرنەوە کە بە بێ هۆیی چونکە گەڵاتوو بەشی یەکەمی « گەڵا »یە کۆتایی کۆتایی بە دەنگی بزوێن هاتووە وەئامرازە لێکدەرەکەشی بزوێنە ئەوا کورتەکەیان تێدەچێ[٢٢] وەوشەی مێگەسوریش بە هۆی ئامرازی لێکدەرەوەدروست‌بووە مێرگ + ە + سور پێناسەکە بەم جۆرە بێ لەبارترە .

ناوی لێکدراو ئەو ناوەیە کە لە دو وشەی سادەی واتادار یان زیاتر پێکهاتووە یا بەیاریدەی ئامرازی لێکدەرەوە پێك‌دێت وەك . گوڵە گەنم ، چاوبەکل یابەبێ‌یاریدە وەك دار گوێز ، شەونم ، گوڵاو

لەوانەی نۆیەمدا لە رەگی فرمانو دۆزینەوەی باس‌کراوە[٢٣] وەکو مەڵێ یاساو دەستور بۆ چاوگەکان هێنراونەتەوە بۆ دۆزینە رەگەکان بە پێ‌ی نیشانەی چاوگ باسی لێوە کراوە دەبینین لە بەشی دووەمی رەگی فرماندا کە باسی لە چاوگە «و» و «ی» یەکان کراوە . نوسراوە بۆ دۆزینەوەی رەگی فرمانی چاوگی «واوی» سەیری چاوگەکە دەکەین[٢٤]

ئەگەر چاوگەکە تێ‌پەر بێت تەنها بە لابردنی نونی چاوگەکە رەگی فرمانەکە دروست دەبێت واتا رەگی چاوگەکانو تەوەکانیان وەکو یەکن وەك وێنەی «ب»

| چاوگ | قەد | دەگ |
|---|---|---|
| دروون | دروو | دروو |
| چوون | جوون | جور |
| گروون | گروو | گروو |

لەم بابەتەدا دەبوا سەرنج بۆ ئەم کێشەیە رابکێشرابایە کەقەدو رەگ وەك یەك نین ئەمن وای بۆ دەچم کە ئەم چاوگانە لە بنەرەتدا چاوگی یائین «ی» بۆ وێنە

| | |
|---|---|
| دروون | درووین |
| جوون | جووین |
| گروون | گرووین |

بۆ ئەم مەبەستە هەندێ نمونەو رستە دەهێنینەوە بە تایبەتی لە هەردوو چاوگی دروین‌و جووین‌دا وەك .

من بنێشتەکەم جووی ، گەنمەکەمان دروی جووی ، درووی هەردویان قەدن ئەمانە بۆ کرداری رابردوو . بۆرانەبردویش وەك :

بنێشتەکە دەجووم . گەنمەکە دەدروم . جوو ، دروو

هەردویان رەگی کردارن وەبۆ گروین‌یش هەمان مەبەست وەئەم شێوە قسەکردنەش بە تایبەتی لە ناوچەی گەرمیان‌دا بەکار دەبرێ . لەبەشی سێیەمی دۆزینەوەی رەگی کرداردا لەو چاوگانەی باس کراوە کە « ی » یائین نوسراوە بەلابردنی نیشنانەی چاوگ ئەوا رەگیان بۆ دەمێنێتەوە ئەگەر لە پێش نیشانەکەوە «ا» هاتبێت ئەوا «ا» دەبێ بە «ێ»[٢٥] لەشێوەزاری گەرمیان‌دا کە سەر بە دیالیکتی سلێمانیە چاوگی « یائی » مان هەیە بەلابردنی نونی چاوگی قەدمان بۆ دەمێنێتەوە نەك بەلابردنی نونی چاوگ‌و نیشانەی چاوگ وەك ئەو نەونەی « زایین »ە کە لە کتێبەکەدا باس کراوە هەر هەمان نمونە وەردەگرین .

زایین بەلابردنی نونی چاوگی «زایی» دەمێنێتەوە کە قەدی کردار چاوگە لە بری ئەوەی بلێین « بزنەکەزا » دەڵێن « بزنەکە زایی » نمونەی ئەم دۆخە زۆر کەمە . لەبەشی «٥ ، ٦»ی دۆزینەوەی رەگی کرداردا بە دوورو درێژی باسی لێوەکراوە بە پیاچونەوەیدا زۆر دوچاری کۆمەلێ هەڵە دەبینەوە ئەمانەش وا لە قوتابی دەکا زۆر بەگرانی فێری بابەتەکە بێ پێویستە هەوڵ بدرێ بۆ ساغ کردنەوەیان لەم دوو بەشەدا باس لەو چاوگانە کراوە کە نیشانەکانیان « ن ،تن» ،ن نوسراوە . بۆ دۆزینەوەی رەگی فرمان ئەو چاوگانەی کە بە «تن ،دن» دوایان دێت هەمیشە نیشانەی چاوگەکە لادەبەین‌و پیتی بزوێنی پێش پیتە دەنگ دارەکەی بەردەم نیشانەکە دەکەین بە «ێ» جا ئەگەر ئەو پیتە دەنگ دارە «ش» بێت دەیکەین بە «ژ» وەئەگەر «س» بێت دەیکەین بە «ز» وەکو لە لیستەی سەرەوەدا پیشانمان داوە[٢٦] .

ئەگەر بە سەرنجێکی وردەوە لێی بکۆڵینەوە ئەم تێبینی‌و رایە بە هەڵەی دەزانین چۆن . . . ؟

١ – مەرج نی‌یە هەموو «ش» ی بگۆرێ بە ژ ،خ)وەکو لەم چاوگانەدا .

| چاوگ | رەگ |
|---|---|
| فرۆشتن | فرۆش |
| هاویشتن | هاو |

نموونە/پەلێ دەهاوم .

٢ – لە هەندێ چاوگی تردا وەك «رشتن»دەنگە بزوێنەکە دیار نی‌یە تاوەکو بگۆرێتە دەنگی «ێ» .

٣ – لە پەراوێزی ژمارە (١)دا بەم شێوەیە نوسراوە کە گوایە «ش ،س تەنهاپێش نیشانەی «تن»ەوەدێن لە پێش «ین»ەوە نایەن ئەمەش هەڵەیەکی زور زەقە چونکە چاوگمان هەیە کە دەنگی « ش ،س» لەپێش «ین»ەوە بێت وەك

س : لە چاوگی «هەڵواسین‌و نوسین»دا .

ش : لە چاوگی «هەڵ‌لوشین‌و گوشین‌و دۆشین»دا

٤ – دەبوایە ئەوە رون بکرایاوە کە لە زۆربەی ئەم چاوگانەدا لە حاڵەتی حاڵەتی رانەبردودا یاخود رەگی کردار هەموو دەنگەکانی (A,i) دەگۆرێ بۆ «ێ» ، e . تەنها لە کرداری بکەر نادیار (Pasive) دا لە شێوەی رابردودا A,i)ە وەك «نوسرا» لە رانەبردوودا «ێ»e «ئەنوسرێ» ئەمەش خاسیەتێکی زمانەو کە شێوەی دەنگە بزوێنەکان لەو دۆخەدا دەگۆرین .

٥ – هەندێ لە چاوگەکان لە تێنەپەرەوە کراون بە تێپەر بە هۆی پاشگری « اندن» Andin ەوە وەك Andin .

**درین – دراندن**

**دۆران – دۆراندن – چووەنە سەر رەگ**

**قیژاندن چووەتە سەر دەنگی سروشتی**

بۆ دۆزینەوەی قەدو رەگی کردار ئەو رێگایانەی کە لە کتێبەکەدا باس کراون بە ئەرك‌و قورسی دەزانم بێ گومان سەر لە

قوتابی دەشێوێنێ‌و توشی چەندەها هەڵەی دەکات لە باسەکە دەترازێ هیچی بە سەریەوە نامێنێ جا بۆ ئاسانکردن‌و زیاتر تێگەیشتنی قوتابی ئەم ڕێگایە بە پەسندتر دەزانم . . .

بۆ دۆزینەوەی قەدی کردار چاوگەکە وەردەگرین‌و نونی چاوگی لێ‌دادەمالین ئەوی دەمێنێتەوە قەدی کردارە کە سەرچاوەی دروست‌بونی کرداری ڕابردووە بە هەموو دەمەکانی‌یەوە وەك

---

چاوگی ئەلفی «ا» تێپەر : کێلان بەلابردنی «ن» کێلا
تێنەپەر : سوتان سووتا
چاوگی دالی «د» تێپەر : بردن بەلابردنی نونی چاوگ برد
تێنەپەر : مردن مرد
چاوگی واوی «وو» تێپەر : جوون جوو
تێنەپەر : بوون بوو
چاوگی تائی «ت» تێپەر : کوشتن کوشت
تێنەپەر : کەوتن کەوت
چاوگی یائی «ی» تێپەر : کڕین کڕی
تێنەپەر : فڕین فڕی

---

وە بۆ دۆزینەوەی ڕەگی کرداریش ئەم دەستورە گشتی‌یە دەگرینە بەر چاوگەکە وەردەگرین‌و کردارێکی ڕا نەبردوی لێ‌دروست دەکەین ئەوجار نیشانەی ڕانەبردوو و جێناوەلکاوەکەی لێ‌دادەمالین ئەوی دەمێنێتەوە ڕەگە" وەك

---

چاوگی ئەلفی «ا ، A» تێپەر : کێلان دەکێلم کێڵ
تێنەپەر : سووتان دەسووتێم سووتێ
چاوگی دالی «د ، D» تێپەر : بردن دەبەم بە
تێنەپەر : مردن رەمرێ مر
چاوگی واوی «وو ، U» تێپەر گروون دەگرووم گروو
تێنەپەر : بوون دەبین بـ
چاوگی تائی «ت ، T» تێپەر : فرۆشتن دەفرۆشن فرۆش
تێنەپەر : فڕین دەفڕێ فڕ

---

ئیدی چیتر پێویست بەو درێژە پێدانە ناکات وەئەگەر قوتابی لە سەر ئەم دەستورە ڕاهات ئەوا زۆر بە هاسانی دەتوانێ قەدوو ڕەگەکان بدۆزێتەوە ئەمجار لە قۆناغی دواترو پێشکەوتو ترا لە گۆرین‌و لابردن‌و تێچونی دەنگەکان بکۆڵێتەوە لەم ڕووەوە دەتوانێ زادەی بیرکردنەوەو وردبونەوە ڕێزمانی‌یەکان پەرەپێ‌بدا .

لەوانەی دەیەمدا ولەباسی کرداری ڕابردوو[٢٧] وهەر چوار بەشەکەی دارابردوی ڕووت . تەواو بەردەوام ، دوور لەبەشی یەکەمیان مانای « ڕووت » ڕون‌نەکردۆتەوە تەنهائەوەنەبێ کەنوسراوە ڕودانی فرمانەکە پێش کرداری ئاخاوتن تەواو بووەو گەیشتۆتە ئەنجام ، گومانی تێدا نی‌یە کە کرداری ڕابردوو بە هەموو بەشەکانی‌یەوە پێش ئاخاوتن ڕوی داوە دەبوایە «ڕووت» بەوەلێك بدرابایەوە کە هیچ نیشانەیەك یان پاشگرێکی لەگەڵدا نی‌یە . وەبەشی دووەم بەتەواو دراوەتە نوسین لێرەدا تەواو مانای ڕاستی ناپێکێ چونکە کە وترا ڕوودانی کردارەکە لە کاتی ئاخاوتنەوە نزیکە دەبوایە بە ڕابردووی نزیك دابنرێ . . . داخستووە .

وەلەبەشی سێ‌یەمدا ڕابردووی بەردەوام ئەو باسکردنەی زۆر تەواو نی‌یە دەبوایە وشەی بەردەوامی لێك‌بدرابایەوە . چوونکە ڕوودانی کردارەکە بە ئەنجامی بەردەوامی‌یە لەگەڵ ئاخاوتن‌دا یاخوود لەگەڵ ڕوودانی کردارێکی دیکەدا . دادەخست .

بۆ ڕابردووی دوریش دەبوایە بەم جۆرە باس بکرایە « ئەو کردارەیە کە ڕوودانی لە کاتی ئاخاوتنەوە دوورە» سەرەڕای ئەمانەش لە لاپەرە (٦٠)دا وە لە « بەکورتی» باس کردنی کردارەکان‌و ئەو نمونانەی کە بۆیان هێنراونەتەوە لەگەل (أ ،ب)دا ناگونجێ کە بەم جۆرە نوسراوە

أ – ڕابردوی ڕووت داخستووە
ب – ڕابردووی تەواو داخست
جـ – ڕابردووی بەردەوام دادەخست
د – ڕابردووی دوور داخستبوو

ڕاستی یەکەشی بەم جۆرەیە :

أ – ڕابردووی سادە ، ڕووت داخست
ب – ڕابردووی نزیك تەواو داخستووە
ج – ڕابردووی بەردەوام دادەخست

**د – رابردووی دوور داخستبوو .**

**کورتە هەڵسەنگاندنێکی . . زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی ژمارە (٢) هەولێر ١٩٨١ .**

لە قوناغی پۆلی چوارەمی ئامادەیی‌دا رێزمانەکەی لە شانزە وانەدایە لەوانەی یەکەمدا باس لە راناوی لێکدەر دەکا بە سێ نمونەوە درێژە بە باسەکە دەدات وەلە هەر سێکیاندا لە «کە ،» دواوە وەبە راناوییای‌کە» داوەتە نوسین بۆ نمونە لە رستەی یەکەمدا بەم جۆرە باس کراوە . رستەی یەکەم لە دوو پارچە رستە پێك‌هاتووە رستەی « ئەم شارە جوانەو رستەی « ئەم شارەشەقامی زورە وەهەردوکیان بەیاریدەی ووشەی «کە» وە دراونەتە دەم یەکتر بەلاّم وشەی «کە» جگە لەوەی کە ئەو دوو رستەیەی پێکەوە بەستووە جێ‌ی ناوی « شار»یشی گرتۆتەوە لە رستەی دووەمدا « ئەم شارە شەقامی زۆرە» «بۆیە بەوشەی «کە» لێرە دەگرترێت « راناوی لێکدەر[٢٨] . لێرەدا ئەگەر بە سەرنجێکی وردەوە لە رستەکە بکۆڵینەوە دەبینین «کە» جێ‌ی ناووی شاری نەگرتۆتەوەو ئەگەر جێ‌ی گربێیتەوە دەبوایە روون بکرابایەوە «کە» وەکو راناو تەماشا ناکرێت هەر وەها ناتوانین بڵێین لێکدەرە چونکە لێکدەر ئەوەیە کە دوو رستە یان دوو وشە لە یەك دەدا بۆ رستە وەك .

**من دەرۆم بۆ بازارو سەر لە هاورێکەم دەدەم**
**بۆ وشە وەك . نان و رۆن ، پەڵپنیە بە ترش .**

کە بڵێین « ئەم شارە کە شەقامی زورە » رستەیەکی تەواو نی‌یە بەڵکو لا رستەیە ئەگەر لێکدەر بوایە ئەوا هەردو رستەکە مانای تەواوی خۆیانی دەبەخشی باشتر وایە کە بە ئامرازی گەیەنەری لێك بدەینەوە چوونکە دوو رستە دەگەیەنێتە یەك وەرستەیەکی ئاڵوزپێك دەهێنێ . وەبۆ نمونەکانی تریش هەمان مەبەست دەبینین لە وانەی دووەمدا باس لە رستەی ئاوێنە دەکات نمونەکانیشی هەر لە سەر شێوازی وانەی یەکەم دارێژراون وەهەمان هەڵە دوبارەو سێ بارە کراوەتەوە کە «کە» بە ووشەی لێکدەر دراونەتە نوسین . لەوانەی پێنجەمداو لە باسی ئاوەڵناوی تەرتیبی‌دا هەندێ لە مەسەلەکانی رێزمانی نەپێکاوە بۆ نمونە لە کورتەی باسەکەدا نوسراوە .

«ئاوەڵناوی تەرتیبی ئەو ئاوەڵناوەیە کە ژمێراوەکانی خۆی واتە « مەوسونەکەی » بە شێوەیەکی تەرتیبی پیشان دەدات» . ئەم ئاوەڵناوە تەرتیبی‌یە .

١ – لەو ئاوەڵناوە بنجی‌یانەی کە کۆتایی‌یان بە پیتە دەنگی دێت بە پاشگری (ەم»و «ەمین» دروست دەکرێت بەلاّم ئەو ئاوەڵناوە بنچییانەی کە کۆتایی‌یان بە پیتە بزوێن دێت بە پاشگری «یەم» و «یەیین» دروست دەکرێن[٢٩] ئەمەش لەگەڵ «دوو»داری ناکەوێ تەنها لەگەڵ (سێ) دانەبێ کورد ناڵێ « دوو+یەم . دوو+یەمین

دەبێ ئەوە راست بکرێنەوە بەم جۆرە دوو + ەم دوو وەم

Du + em – Duwem) Du + em – Duwem

جگە لەمەش دەبوایە (هەم»و (هەمین) باس بکرابایە وەلەگەڵ زۆربەی ژمارەکاندا دەگونجێ لە باسکردنی « گۆرینی کرداری تی‌نەپەر بۆ تی‌پەر»دا کە لە وانەی دەیەمدا باس کراوە هەندێ تێبنی فەرامۆش کراوە بۆ نمونە . . . .

١ – هەندێ چاوگمان هەیە بەر ئەو یاسایە ناکەون کە رەگەکانیان وەربگرین پاشان پاشگری « اندن» Andin» یان پێوە یلکێنین وەك هاتن ، رۆیشتن ، مان کەوتن ئەم چاوگانە هەموویان تی‌نەپەرن وەدەتوانین تی‌پەرەکانیان بدۆزینەوە وەك

| تی‌نەپەر | تی‌پەر |
| --- | --- |
| هاتن | هێنان |
| رۆیشتن | ناردن |
| مان | هێلاّن |
| کەوتن | خستن |

ئەگەر چی کەوتن دەتوانین پاشگری « اندن » بەرەگەکەیەوە بلکێنین بیکەینە تی‌پەر .

٢ – لە پەراوێزی ژمارە (١)ی هەمان باسدانوسراوە « چەند فرمانێکی تی‌نەپەر لە چاوگی فرین ، جوون ، رۆیشتن ، مان»ەوە وەردەگرین بەم رێگەیە ناکرێن بە تی‌پەر[٣٠]

٣ – لە خشتەی لاپەرە (٤٦)دا کە وەکو خۆی دەینووسینەوە لە بەکارهێنانی پاشگری «اندن»دا هەندێ کەم‌و کورتی دەردەکەوێ .

| چاوگی تێپەر | ڕەگی فرمان +پاشگر «اندن» | چاوگی تێپەر |
|---|---|---|
| سووتان | سووت + اندن | سووتاندن |
| گریان | گری + اندن | گریاندن |
| مردن | مر + اندن | مراندن |
| نوستن | نوو - اندن | نوواندن |
| گەیشتن | گە + ی + اندن | گەیاندن |
| بڕژان | بڕژ + اندن | بڕژاندن |

لە دوو چاوگی « سوتان ، بڕژان»دا لە خشتەکەدا ڕەگەکانیان «سووت» ، بڕژ»نین بەڵکو « سوتێ ، بڕژێ»ن ئەم دوو چاوگە چاوگی تێنەپەری ئەلێن لەم جۆرە چاوگانەدا قەد وەردەگرین و پاشگری «اندن»ی پێوە دەلکێنین وەك

**سووتا + اندن – سووتاندن**

**بڕژا + اندن – بڕژاندن لە هەردوویان دوو بزوێن**

لە یەك دەدەن کۆتایی قەدوو سەرەتای پاشگر یەکیان تێدەچێ دەبوایە ئەم تێبینیەش ڕەچاو بکرابایە .

٤ – لە بەکار هێنانی چاوگی هێناندا دەبوایە باسی ئەو بزوێنە بکرابایە کە وەکو ئەنتەرفێکس دە چێتە نێوان هێنانو یان چاوگ یان ڕەگ یان دەنگە سروشتی‌یەکان وەك . . .

**هێنان + ە +پێ‌کەنین**

**هێنان + ە + باراندن**

**هێنان + ە + بارە . . . تاد**

لە باسکردنی چاوگ لە ڕووی پێکهاتنەوە وەلەوانەی دوانزەهەمدا[٣١] دوو چاوگی

١ – «بەردان ، ڕاکردن» وەك چاوگی داڕێژراو حسێب کراوە بە بێ ئەوەی بیری لێ بکرێتەوە بەو پێ‌یە بێت هەردوو وشەی « بەر »ی چاوگی بەردانو ، «ڕا» لە چاوگی ڕاکردن داپێشگرن . «بەر» وەکو وشەیەکی سەربەخۆ تەماشا دەکرێ کە ئاوەڵکردارێکی سادەیە . ئەگەرچی چاوگی « بەردان » پێچەوانەی « گرتن »ە بەلاّم هەر وشەی «بەر» مانای تایبەت خۆی هەیە نەك پێشگر .

سەبارەت بە «ڕا» دەتوانین بڵێین کورت کراوەی « هەرایە» کە لە دیالیکتی سۆراندا بە مانای خێرا ڕۆیشتن باوە کەوا بێ « هەرا»ش مانای سەر بە خۆی خۆی هەیە وەبەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ چاوگی «کردن» دابێت بۆ ئەو مەبەستەی کتێبەکە نمونەی «ڕاهێنانو ڕاهاتنو ڕابردن» بهێنرابایەوە باشتربوو چوونکە لەم نموونانەدا «ڕا» وەکو پێشگر خوی دەنوێنێ .

٢ – لە هەمان باسداو لەوانەی سیانزەهەمدا هەمان هەڵە دوبارەبۆتەوە لەگەڵ ئەوەشدا چاوگی « لێدان» ی لێکدراو بە داڕێژراو دانراوە . هەروەها چاوگەکانی «دەست لێ هەڵگرتن ، تەنگ پێ هەڵچنین » بەلێکدراو دراونەتە نوسین[٣٢] دەبا لە چاوگەکان ورد بینەوەو بیانخەینە باری سەرنجی زمانەوانیەوە چاوگی (لیدان) چاوگێکی لێکدراوە نەك داڕێژراو چوونکە لە ئامرازێکی پێوەندیو جێناوی کەسی سێ‌یەمی تاكو چاوگێکی سادەپێك هاتووە .

امرازی پێوەندی + جێناوی کەسی سێ‌یەمی تاك + چاوگی سادە

لە + ئەو + دان یاخود

لە + وی + دان

لێ + دان

ئەگەر تۆزێ لەم گۆڕانە وردبینەوە دەبینین «وی»بەرامبەر « ئەو » دەوەستێ « وی » « وێ » لە ناوچەی سۆرانو موکریاندا کەسی سێ‌یەمی تاکە .

لە ویم‌دا (بۆنێر) لە وێم‌دا (بۆمێ) لەوم دا . . . کەواتە ئەم چاوگە لێکدراوە نەك داڕێژراو وە «لێ»ش پێگر نی‌یە بەڵکو ئامرازو جێناوە . وەبۆ دوچاوگی (دەست لێ‌هەڵگرتنو تەنگ‌پێ‌هەڵچنین) (لێ ،پێ) هیچیان پێشگرنین وەبە هۆی پێشگری (هەڵ)ەوە کە لە پێشدا کردونێتی بە چاوگی داڕێژراو کە داڕێژراو بن با وشەی تریان بچێتە سەر هەر . . . داڕێژراون نەك لێکرراو .

لەوانەی چوارەمدا دەربارەی فرمانی یاریدەدەر باس‌کراوە ئەوی ڕاستی بێت تەنها لە ڕستەی یەکەمدا کرداری «بوو» وەکو کردارێکی بێ هێز خۆی دەنوێنێو یاریدەدەرە بۆ دروست‌کردنی کرداری ڕابردووی دوور . کرداری ڕستەکانی تر وەکو کردارێکی سەربەخۆ دەوری خۆیان هەیە لە پێکهێنانی ڕستەکاندا کرداری بنچینەن لە ڕستەی دووەمو سێ‌یەمی بەشی یەکەم‌دا هەر یەکەیان کرداری ڕستەی خۆیانو کەرستەی ئاڵۆزن[٣٣] لە بەشی دووەم‌دا کرداری (دەمویست سەرتان لێ‌بدەم) دەمویست کردارێکی سەربەخۆ کە کردارێکی تێپەرەو باس لە شتێك (مفعول) وەلەرستەکەدا نی‌یە . کە دەڵێن دەمویست یان دەمانەوێت شتێك هەیە کە ویستبێتم یان بمانەوێت ئەویش نیاز

یان خوازه کەوا بێ هەردوکیان رستەیەکی سەربەخۆن‌و کردارێکی سەربەخۆن نەك بەیاریدە وەلە رستەکانی بەشەکانی سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەمدا هەموویان رستەی سادەن وەهەموو کردارەکانی هێنان ، هاتن ، خستن لە بنەرەتدا ووشەی تریان چووەتە سەر کردارێکی لێکدراویان دروست‌کردووە بە هۆی ئەنتەرفێکسی (ە)ەوە وەك :

**هاتن + ە + پێ‌کەنین   چاوگ**
**هاتن + ە + کوشتن   پاسیڤ Pasive**
**خستن + ە + خەو**

لێرەدا پێویستە بگوترێ ئەمانە کرداری لێك‌دراون وەبەیاریدەیەکەشی بە روونی ساغ نەکراوەتەوە . بۆ نمونە لەرستەکانی بەشی سێیەمدا رستەیەکی تێ‌پەر دروست‌کراوە لە رستەکانی بەشی چوارەمدا کرداری بکەرنادیاری دروست کراوە (Pasive) لە بەشی پێنجەمدا وەکو کردارێکی تێ‌پەر خۆی نواندووە . دوا سەرنجمان لە بارەی ئاوڵفرمانی چۆنی‌یەوەیە ئەویش ئەوەیە کە لاپەرە (٦٢)دا نوسراوە « ئەم ئاوەڵفرمانە چۆنی‌یانە هەیانە سادەن لە یەك وشەی واتاداری سەربەخۆێك هاتوون وەك خێرا ، باش ، چاك ، خراپ ، توند ، گورج ، پاك ، پیس . .)دا

هەیانە (دارژاوە) وەك : ( بەسواری ، بە گەرمی ، بە پەلە ، دلێرانە ، شێرانە . .هتد) وەهەشیانە لێکدراو وەك : ( بەدڵ‌شکاوی ، بە پێ‌ی پەتی ، سەر بەرزانە) هیچان لێکدراو نین بەڵکو دارێژراون چونکە پاشگریان چووەتە سەر وەك :

١ – ئامراز + ئاوەڵناو + پاشگر ،      ٢ – ئاوەڵناو + پاشگر
به + دڵشکاو + ی      سەربەرز + انە

پێشنیاز دەکەم کە راست‌بکرێنەوە .

## کورتە هەڵسەنگاندنێکی
## زمان‌و ئەدەبی کوردی بۆپۆلی پێنجەمی ئامادەیی چاپی ۱۹۸۱ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ژمارە (۲) هەولێر.

١ – لەوانەی حەوتەمداو لە باسی ئاوەڵناوی بکەری دارێژراودا هەندێ ناوی وەك مەلەوان ، نوسەر ، نانەوا ، ئاسنگەر ،کریار ، بە ئاوەڵناو دراونەتە نوسین[٣٥] ئەگەر لەم وشانە بکۆڵینەوە لە روی رێزمانەوە لێیان بدوێین تایبەتی‌یەکی ناویان تێدایە ناچنە ریزی ئاوەڵناوەوە ئەم ناوانەش زیاتر مەبەستی پیشەیان ئیش ئەپێکن سەرەرای ئەوەش لەگەڵ پلەکانی ئاوەڵناوی چۆنیشدا ناگونجێن بۆ نمونە نابێ بڵێین ( سمایل لەمام سۆفی کریارترە»یان « نانەواترین کەسیان هەڵبژارد» تادوایی .

وەلە راهێنانی (۳)ی هەمان باس نوسراوە چەند ئاوەڵناوی بکەر لەم پاشگرانە دەتوانین دروست‌بکەین بیان‌نووسەو جۆرەکانیان بڵێ «چی ، کا ، ساز ، یار ،تاش ،کەر[٣٦]» ئەگەر سەیری وشەکانی وەك «کار ، فرۆش ،تاش» بکەین‌و لێیان وردبینەوە هیچیان پاشگر نین بەڵکو وشەی سادەن «کار» ناوێکی سادەیە « فروش ، تاش» رەگی چاوگی « فرۆشتن‌و تاشینە» ئیدی کەی پاشگرن . . .

٢ – لەوانەی هەشتەمدا باسی ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو کراوە کە چی زوربەی نمونەکان وشەی دارێژراون[٣٧] تەنها وشەی « ئاوکێش ، دەست‌بر ، پیاوکوژ» نەبێ وشەکانی « ئاودەر ، سوال‌کەر ، نان‌دەر ، پەیام‌بەر» لە بنەرەتدا هەموویان دارێژراون کە دەڵێن وشەی لێکدراو مەبەستمان ئەوەیە کە لە دوو وشەی سادەی وانادار پێکهاتووە کە چی ئەو نمونانە ئەو مەبەستە نادەن بەدەستەوە .

وەراستە کە لە چاوگی لێکدراوی ( ئاودان‌و سوال‌کردن‌و نان‌دان‌و بەیام‌بردن)ەوە وەرگیراون ئەم چاوگانە رەگەکانیان وەرگیراوەو پاشگری (ەر) ونیشانەی کرداری داخوازی «ب»یان چۆنە سەر بەلآم ئەو نیشانەیە نیشانەی داخوازی تێ‌چووەو نادرکێنرێ کە بنەرەتیەکانیان « ئاوبدەر ، سوال‌بکەر ، نان‌بدەر ، پەیان ببەر»ن وەتایبەتی‌یەکی بکەری وەردەگرن کەوا بێ ئەمانەش هەر وشەی دارێژراون . وەلە لاپەرە (۳۲ ، ۳۳)دا «لە بەکورتی»هەمان هەڵە دووبارەکراوەتەوە نوسراوە «ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو وشەیە سیفەتێکی هەمیشەیی‌و توانایەکی تایبەتی دەبەخشێت بە هەڵگرەکەی‌و لە چاوگی لێکدراو زۆر جار بەیارمەتی پاشگرو پێش‌گرەوە» دروست‌دەکرێت . . .تاد .

لە دروست‌کردنی ئاوەڵناوی کراودا زۆر زانستیانە باس نەکراوە بەرێگەیەکی ئاڵۆزدا براوە ، بەتایبەتی لە رێگای یەکەمدا چاوگە تێ‌پەرەکان کراون بە تێ‌پەری نادیار لەوەوە قەدی کردار . وەرگیراوە وەپاشگری «و» خراوەتە سەر . . . .
وەك

وەك

| جاوكى تيپەرى ديار | جاوكى ناديار | قەدى ناديا | ئاولناوى كراو |
|---|---|---|---|
| كوشتن | كوژران | كوژرا | كوژراو |

باشتر وايە كەرەگى چاوگ وەربگرين پاشگر يان نيشانەى «راو»ى بخەينە سەر كە ريگايەكى هاسانو لە بارە بۆ دروستكردنى

| چاوگ | رەگى چاوگ | +راو |
|---|---|---|
| برين | بر | برراو |
| ناردن | نێر | نێرراو . . . هتد |

وەلە ريگاى دووەمدا چاوگى تێنەپەرى « واوى»و ، ىا هێنراوەتە ناوانەوە بێ ئەوەى نمونەشى بۆ هێنرا بێتەوە . . . نوسراوە ئەگەر چاوگەكە خۆى تێنەپەر بێت ئەوا يەكسەر ، قەدى فرمانەكەى وەردەگرينو پاشگرى «و ،w» لەگەڵ ئەوقەدانەدا بەكار دەهێنين كە بە « ۱ ، ى ،و» دواييان هاتووە (۳۹)

لێرەدا دەڵێين كوا قەدانەى كە دواييان بە «و» هاتووە ؟ . . . بەڵێ «ا ،ى» هەيە وەك :

برژان ——← برژا ——← برژاو
چەقين——← چەق ——← چەقيو نمونەكانى لاپەرە (۳٤)

وەك چۆن لە ئاوەڵناوى بكەرى لێكدراودا بە هۆى پاشگرەوە كە چووەتە سەر رەگى چاوگە لێكدراوەكان ئاوەڵناوى بكەرى لێكدراويان لێ دروستكراوە ئلواش لەوانەى دەبەمداو لە لاپەرە (۳۸) دا باسى لە ئاوەڵناوى كراوى لێكدراو كراوە . وەك ئەم نمونانە :

سووتان دڵ سووتان دڵ سووت + او
خواردن بەش خواردن بەش + خو+ راو
لەوشەيەكى سادەو وشەيەكى دارێژراو پێكهاتوون

لە گۆرينى كردارى بكەر ديار بۆ بكەر ناديار كە لە لاپەرە (٤۲) باسى لێوە كراوە دەبينين باسەكە فراوان نىيە هەندێ تێبينى تر هەن نەدەبوو رەچاو نەكرابايە وەك :

۱ – بۆ گۆرينى كردارى بكەر ديار بۆ ناديار هەندێ چاوگ . كردارى هەن كە تێ نەپەرن دەبێ بكرێنە تێپەر ئەوجا كردارى بكەر نادياريان لێ دوروستدەكەين وەك :

| تێنەپەر | تێپەر | | |
|---|---|---|---|
| ئازاد كەوتن | سەرباز | ئازادى كەواند | رابردوو |

ئازاد دەكەوێ . سەرباز ئازاد دەكەوێنێ رابردوو رانەبردوى بكەر ديار .

بۆ ناديار ئازاد كەوێنرا . ئازاد دەكەوێنرێ .

| چاوگى تێنەپەر | رەگ | +پاشگرى «اندن» |
|---|---|---|
| كەوتن | كەو | كەواندن |

رەگى كەواندن

وەردەگرين كە « كەوێن» پاشگرى «را» بۆ رابردو وەنيشانەى رانەبردوو پاشگرى «رێ» بۆ رانەبردوى پێوە دەلكێين كردارێكى بكەر ناديار دروست دەبێ .

۲ – هەندێ چاوگ هەن لەودەستورە لادەدەن وەك «هاتن» ، رۆيشتن»يە پاشگرى «اندن» نابنە تێپەر بەڵكو چاوگى ترى تێپەر هەن بەراميەريان دەوەستن وەك « هێنان ناردن » رەگى ئەمانە وەردەگيرێ وەپاشگرى «را» بۆ رابردوو «رێ» بۆ رانەبردون لەگەڵدا بەكار دەهێنين لە كتێبيەكەدا زۆر بە كورتى وسەرپێيانە باسى لێوەكراوە باسەكەش هەر باسى رستەى ديارو ناديارە كە وەرگيرانە ئينكليزى يەكەى (Active Voice – Pasive Voise)ە .

دوونمونەى «لێدانو راكردن» كە لە ژێر ناونيشانى چاوگى دارێژراوودادانراونو كردارى دارێژراويان لێدروست كراوە (٤۰) لە «لێدان»دا بە تەواوى شينەڵىكەينەوە دەبينين لە ئامرازى پێوەندىو جێناوى لكاوى كەسى سێيەمى تاكو چاوگێكى سادەپێكهاتووە لە + وێ + دان (٤۱)

لێدان

وەرا کردنیش بە هەمان مەبەستی پێشو کە هەردویان چاوگی لێکدراون نەك دارێژراو . لە لاپەرە (٥١)دالە باسی فرمانی لێکدراوذا چاوگە دارێژراوەکان وەرگیراونو وشەی سادەی تریان دراوەتە پاڵ وکراونەتە لێکدراو دەبوایە بە چاوگی دارێژراو بدرێنەقەڵەم ئەمەش لە پۆلی چوارەمدا باسمان لێوە کردووە لەشیکردنەوەی راهێنانی ژمارە (٤)لاپەرە (٦١)دا « ئەم هەنارەم لە دارهەنارەکە کردەوە»م : شی نەکراوەتەوە لە بیرچووە .

لە دواوانەدا وانەی نۆزدەهەم لە باسی ئامرازی پێوەنی لێکدراودا[٤٢] ئەگەر سەرنجی هەموو ئامرازەکانی نێو رستەکان بدەین وەك «لە ژێر ، ەسەر ، لە ناو ، بەلا ، لەتەك ، بەبێ» کە هەموویان بە ئامرازی پێوەندی لێکدراو هاتوونەتە ناوانەوە بە پێی کتێبەکە لێرەدا سەرنج بۆ چەند خاڵێك رادەکێشین .

١ – زۆربەیان زیاتر لە ئاوەڵکرداری لێك دراون لە ئامرازێکی پێوەندیو ئاوەڵکردارێکی سادە پێکهاتوون لە . . .دا لەناو دا

لە . . . .دا لە ژێر دا

بە . . . دا بە لا دا .

لە . . . .دا لە تەك دا تادوایی . . . .

٢ – کە باسی ئامرازی پێوەندی کراوە ئەوە لەبیرکراوە کە بەم شێوەیەن لە . . .دا ، بە . . .دا ناو یائاوەڵکردار ئەچێتە نێوانیانەوە .

٣ – لە رستەی چوارەمدا « ئێمە بە لای ئێوەدا تێپەرین» ئەگەر « بەلا» ئامرازی پێوەندی بێت میانەی ئێمەی بەلای ئێوەدا پیشان داوە ئەوا ئامرازێکی پێوەندی تری لە گەڵدا هاتووە وەك «ی» لە « بەلای ئێمەدا» لێرەدا دوو ئامرازی پێوەندی بە دووی یەکدا هاتوون ئەگەر وەکو کتێبەکە بۆی بچین گومانی تێدا نی یە کە لە رێزمان دوو ئامرازی پێوەندی بە دوویەکدا نایەن ئەوا دەبێ بڵێین «بەلا» ئامرازی پێوەندی نی یە بەڵکو ئاوەڵکردارە – لە ئامرازێکی پێوەندیو ئاوەڵکردارێکی سادە پێك هاتووە .

٤ – لە رستەی دووەمدا « رووەك چۆن کار دەکاتە سەر جوانی سروشت» «ەسەر» لە کتێبەکە بە ئامرازی پێوەندی لێکدراوە . لە راستی دا تەنها «ە» ئامرازی پێوەندییە پێوەندی نێوان وشەی « سەرو چاوگی سادەی کردنی»ی پیشان داوە وەیاخود دەتوانین بڵێین ئامرازێکی لێکدەرە دوو وشەی سادەی لە یەك داوە وشەیەکی لێکدراوی دروست کردووە ئیدی چۆن بە ئامرازی لێکدراوی پێوەندی بدەینە قەڵەم .

## کورتە هەڵسەنگاندنێکی . . .
## زمانو ئەدەبی کوردی بۆ شەشەمی ئامادەیی
## چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ژمارە (٢) هەولێر ١٩٨١

لەوانەی سییەمدا شێوازەکانی جۆری دا بەشکردنی رێژەی رابردووی ئیخباری روون نی یە چوونکە نوسراوە یەکەم رێژەی سادەی ئیخباری وەدوای ئەوەش دووەم رێژەی رابردووی تەواوی ئیخباری هەموو رێژەکان بە پێی ژمارە نوسراوە[٤٣] باشتر وایە بەم شێوەیە بێت . رێژەکان

١ – رێژەی رابردووی ئیخباری ئەمەش بە دەوری خۆی دەکرێ بە چوار بەشەوە :–

أ / رێژەی رابردووی سادەی ئیخباری ب – رێژەی رابردووی نزیکی ئیخباری

ج – رێژەی رابردووی دووری ئیخباری د – رێژەی رابردووی بەرئەنجامی ئیخباری ،

٢ – رێژەی رانەبردووی ئیخباری ٣ – رێژەی داخوازی « ئەمری»

لە کتێبەکەدا لە رێژەی رابردوو و رانەبردووی ئیخباری بە شێوەیەکی تارێکی باس کراوە . یەکسەر باس رێژە ئینشائییەکانو بە دوایدا رێژەی ئەمری باس کراوە جگەلەمانش هەر لە رێژەی رابردووی سادەی ئیخبارییدا جێناوەکان نەهاتونەتە ئاراوە وەبەم شێوەیە دارێژراوە

**چاوگ رێژەی رابردووی سادە[٤٤]**

**کێڵان کێڵا**

. . . . .تاد . .

کە باسی رێژە دەکرێ دەبێ جێناوەکان باس بکرێ .

**چاوگ رێژەی رابردووی سادە**

**کێڵان قەد + جێناو کێڵام ، کێڵات ، کێڵای . . . مان تان یان**

ئەو نمونانەی کەهێندی رتەوە بۆ رستە دەشێن کە زۆر جار لە کرداره تێ پەرەکاندا جێناوەکان پێش قەد دەکەون وەك زەوییەکەم کێڵا . وەلەبەشی دووەمیدا مەبەست لە کتێبەکە کە

له ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ئیخباری‌دا نووسراوە فرمانی ڕابردووی سادەی ئیخباری پاشگری «وو»u بۆ چاوگە «ت ،ی»ی یەکان وەپاشگر « و ،w» بۆ چاوگە «أ ،ی ،و)ی‌ەیەکان[٤٥] لە لایەکەوە «وو ،و» بە پاشگر نادرێنە نوسین بەڵکو وەکو نیشانە خۆیان دەنوێنن چوونکە پاشگر ئەگەر چووە سەر وشە لە رووی واتاو دارشتنەوە دەیگۆرێ لێرەدا مانای کردارەکەی نەگۆری‌وە هەروەها نە لە چاوگەکاندا هەن . پاشگرەکانو پێش‌گرەکان پێش ئەوەی بچنە سەرکردارەکان چوونەتە سەرچاوگەکان لە لایەکی دیکەوە باسی ئەوە نەکراوە کە بۆ چی لە چاوگە (ت ،ی»ەکانی «وو»وە لە (أ ،ی)و»ەکان «و» دەبوایە هۆی ئەمەش رون بکرابایەوە کە «و ، (w نیمچە بزوێنە لە Simivowel وەچاوگە « و ،أی» کۆتایی یان بە بزوێن دێت Vowel . دوو بزوێن بە دوی یەکدا نایەن ئەوا نیمچە بزوێن‌ی «و ،(w بە دوی‌دا دێت لەم دوو لایەنەش بترازێ بە هیچ جۆرێ باسی جێناوەکان نەکراوە وەك

**بۆ تێ‌نەپەرەکان : هاتووم ، هاتووی ، هاتووە**
**هاتووین ، هاتوون ، هاتوون**
**بۆ تێپەرەکان : کێلاَن زەوی‌یەکەم کێلاَ ، کێلاَوە ، کێلاَومە**
**درِین ، کاغەزەکەم دریووە ، دریومە**

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە دروست کردنی شێوازی ڕابردووی نزیکی ئیخباری جووداوازی هەیە لەگەڵ کردارە تێ‌نەپەرەکاندا وەکو لە نمونەکانی سەرەوەدا دەردەکەوێ وەلە هەموو جۆرە چاوگەکاندا «ت ،ی ،د ،أ ،» بە تەنها وەرگیراو واتە کراو (مفعول)باس نەکراوە ئەوا بزوێنی Vowel (ە) دەچێتە دوای جێناوەکەوە وەئەگەریش باس‌کرا ئەوا دەچێتە پاڵ نیشانەکە .

زەوی‌یەکەم کێلاَوە .کێلاَومە
گرووەمە ، بردوومە . . .تاد

لەوانەی چواردەمدا لە لاپەرە ۱۹–۲۱ هەمان هەڵە دووبارەکراوەتەوە کە هەم سەر لە قوتابی دەشێوێنی‌و هەم لە مامۆستا ڕاستی‌یەکەی بەم شێوەیە بێ باشترە .

۱ – ڕێژەی ڕابردووی ئینشائی     هەر چوار بەشەکەی
۲ – ڕێژەی ڕانەبردوو

له ڕێژەی ئەمریش‌دا وەبە تایبەتی ڕێژەی ئەمری ئاشکرا کەم‌و کورتی‌یەکی زۆر زەق بەرچاو دەکەوێ ئەویش ئەوەیە کە تەنها باسی ئەو جۆرە دارشتنە کراوە کە نیشانەی ئەمری «ب» دادەرێژرێ وەباس لەوە نەکراوە کە لە کردارە لێکدراوو دارێژراوەکان ئەو نیشانەیە لادەدەرێ

**لە کردارە سادەکاندا کرین .ب +ڕەگ + جێناو**
**ب + کر + ە ،ن تاك‌و کۆ .**
**لێکدراو سەرکەوتن سەر + ب + کەو +ە ،ن تاك‌و کۆ**
**سەرکەوە سەرکەون**
**دارێژراو هەڵگرتن هەڵ + ب + گر +ە ،ن تاك‌و کۆ**
**هەڵگرە هەڵگرن**

لە باسەکەی‌و شەرح‌کردنەکەدا نیشانەی ئەمری «مە ،نە» فەرامۆش کراوە ئەگەر چی لە نمونەکانی پێشەوەدا هاتوون .

**بەکارهێنانی نە ، مە .بەم شێوانە دەبێ**
**چوون بچۆ .مەچۆ .نەچی**
**کردن بکە مەکە . نەکەی**

لە نێوان ئەم شێوازنەشدا هەر جوداوازی هەیە

**لە «مەکە»دا مە+ڕەگ + جێناوی «ە»و«ن» تاك‌و کۆ**
**لە «نەکەی»دا نە+ڕەگ + جیناوی «ی»«ن» تاك‌و کۆ**

وەبو (مەچۆ ، مەچن – نەچی ، نەچن «هەمان مەبەست لە راهێنانی (ە) پێنجی رستەی ئاوێتەی مەرج‌دا . شی‌کردنەوەی «أ» لاپەرە (۳۸)

ئەگەر شوانەکە بنوستایە گورگەکە مەرەکانی دەخوارد شی‌کردنەوەی «مەرەکان» نوسراوە .

مەرەکان (ناوە –کۆیە – سادەیە – نیهادە – بکەرە – گشتی‌یە

ئەگەر سەرنج بدەینە رستەکە دەبینین «مەرەکان» نیها – دەونەبکەرە بەڵکو تەواوکەرە گورگەکە بەشی نیهادە – بکەرە . . .تا .د

مەرەکانی دەخوارد : بەشی گوزارەیە

دەخوارد : کرادری ڕانەبردوونی‌یە بەڵکو ڕابردوویەکی بەر

ئەنجامی یە لەوانەی یانزەهەمی لاپەرە (٥٣) دا باسی ئاوەڵناوی دارێژراو کراوە هەندێ نمونەکانی وەك « بزن ئاسایی : ئاسنگەر ، نوسەر : خواردوو ، بردوو ، هێنراوەتەوە کە سیفەتی ئاوەڵناویان تێدا نی یە وشەی « بزناسایی» لە شێوەی لێکچواندندایە وەکو «بزن» وەشەکانی « خواردوو ،بردوو» کە قەدی چاوگ ونیشانەی – «وو–u «یان چووەتە سەر هەر لە شێوەی وشەی لێکدراودا خۆی دەبینێتەوە وەکو ، گورگان خواردوو ، کلاّو بابردوو .

لە لاپەرە (٥٧) دادەربارەی ئاوەڵناوی لێکدراو باس کراوە دەربینین نمونەکان باسکردنو لێکۆڵینەوەکان بە شیوەیەکی زانستانە خۆی نەهێناوەتە پێشەوە وەهەندی ، ئامرازی تر هەن کە باس نەکراون دەبوو توّزێ سەرنج بوّ ئەو کێشەیانەرابکێشرابایە وەك : لە دروست‌کردنی ئاوەڵناوی لێکدراودا ئامرازی «ە» لێکدەر بەپیوەندی دراوەتە نووسین .

لە وشەی کوّن + ە + دەوڵەمەند ، جگە لەوەش دەوڵەمەند خوّی ئاوەڵناوێکی دارێژراوە . دەوڵەت + مەند . «وە ئاوەڵناوی چوّنی + ناو» باس نەکراوە وەك بەد + خوو[٤٦] وەهە روەها بەلەیەکدانی دوو ئاوەڵناوی دژواتا ئاوەڵناوێکی ترمان بوّ دروست دەبێ وەك « حازر و بزر – تاریكو روون ، سارد وگەرم» بەهوّی ئامرازی «و» دەبێ وشەی «نەرمونوّڵ» تەواولێ‌ی نەکۆڵراوەتەوە لەم جوّرە بابەتانە کە تایبەتی بە زمانەکەمانەوە وەزوّرن وەك : گورچ‌و گوّڵ ، توندو توّڵ ، شرو شوّڵ . . . کە برتین لە ئاوەڵناوێكو شەیەك کە واتای سەربەخوّی نی‌یە وەهەروەها حاڵەتێکی تر هەیە کە باس نەکراوە ئەویش دوبارە کردنەوەی ئاوەڵناوەکە گوّرینی دەنگی سەرەتاکەی بە دەنگی «م» وەك «خانو مان شل‌و مل ، پاكو ماك . جوانو موان . . . تا دوایی وە ئامرازی پێوەندی‌و چیناو وەك لێ‌زان ، لێ‌خوور ، لێ‌قەوماو ، لێ هاتوو . . تا دوایی ،ئەم حاڵەتێکی ترە لە لاپەرە (٦٢)دا باس لە ئاوەڵفرمان لە رووی بنچینەکانی وشەکانی‌یەوە دەکات وەدەیکاتە سێ بەشەوە ئاوەڵفرملنی سادەو لێکدراو دارێژراو . لە باسی دارێژراودا کە دەکەوێتە ریزی ژمارە «٢»وە هەندێ ئاوەڵفرمان نوسراونەتەوە وەك لە پێش ، بە پەلە ، لە ناودا ، نا بەدڵ ، لە ئاسماندا[٤٧] کە ئەمانە لە ئامرازێکی پێوەندی‌و وشەیەکی تر پێك هاتوون یان ناوو ئامرازی پێوەندی یان ئاوەڵفرمانی سادەو ئامرازی پێوەندی ئاشکرایە کە ئامرازی پێوەندی یان ئاوەڵفرمانی سادەو ئامرازی پێوەندی ئاشکرایە کە

ئامرازی پێوەندی بە پاشگرو پێشگر نادرێنە نوسین ئیدی نەدەبوو بە ئاوەڵفرمانی «ئاوەڵکرداری» دارێژراو بدێنە نوسین وەلەستونی ژمارەیەکدا ئەو ئاوەڵفرمانانەی سەر بە ئاوەڵفرمانی سادەن هەموویان جگە «ئاوەڵکرداری ، ئاوەڵفرمانی پار» نەبێت ئەگەر بە تەنها وەریان بگرین ئاوەڵناون کە چی لە لێکدانەوەو باسکردنەکەدا ئەم سەرنجە یاداشت نەکراوە .

لەوانەی شانزەهەمدا لە ئەرکی راناوی لکاو لەناو رستەدا[٤٨] لە دەوری تەواوکەری راستەوخوّ دەبینین لەم باسەدا تەنها شێوەی سلێمانی بەکارهێنراوەو شێوە زارەکانی دیکە فەراموّش‌کراوە زوّر بە وردی لێ‌ی نەکوّلّراوەتەوە دەبوو نمونە بوّ ئەو شێوە زارانە بهێنرابایەوە .

**بردم ،ئەوم برد جێناوی کەسی سێ‌یەمی تاك دیار نی‌یە**
**بردمیت –          یت بوّ دووەمی تاك**
**بردمن ، بردمن بوّ دووەم‌و سێ‌یەمی کوّ**
**بردمی**
**دەتوانین بڵێین بردم ، بردتم بردمت**
**من ئەوم برد توّم برد منت برد**

لەم رستانەدا دەبینیت بکەرو کراو هەردویان لەگەڵ کردارەکەدان وەبەدوای یەکەوەن کە چی لە شێوەی گەرمیان‌دا بکەر دوای کراو دەکەوێ وە لە شێوەی سلێمانی‌دا کراو دوای بکەر دەکەوێ . . . بێ‌گومان ئەم باسەش نوسێنێکی زوّری لە سەر نووسراوە[٤٩] حەز ناکەم درێژەی پێ بدەم ئەوەندە هەیە دەڵێم دەبوایە ئەو سەرنجانەو یادداشت بکرابایە . . .

## کوّتایی
## پەراوێزەکان

١ – مەبەست لەو دوو دەرسەیە کە لە هەفتەیەکدا دەخوێنرێ

٢ – مەبەست لە کتێبەکە هەموویەتی ئەدەب ، رێزمان ، خوێندنەوە

٣ – زمانو ئەدەبی کوردی بوّ پوّلی یەکەمی ناوەندی لا (١٣) چاپی ١٩٨١

٤ – هەمان سەرچاوەی پێشو

٥ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٥١) چاپی ١٩٨١
٦ – دیوانی مەولەوی . مەلا عبدولکەریمی مودەریس لا (٦)
٧ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی لا (٥٦) چاپی ١٩٨١
٨ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا ٥٦ ، ٥٧) چاپی ١٩٨١
٩ – کورتەیەك دەربارەی چەند بەشێکی مۆرفۆلۆژی زمانی کوردی بۆ دەورەی سێیەمی مامۆستایانی ناوەندیو ئامادەیىو قوتابخانەکان .
د . فاروق عمر صدیق لا (٨)
١٠ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی لا ٧٨ چاپی ١٩٨١
١١ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی لا (٧) چاپی ١٩٨١
١٢ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٢٠) چاپی ١٩٨١
١٣ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٣١-٣٢) چاپی ١٩٨١
١٤ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٣٧) چاپی ١٩٨١
١٥ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٣٧) چاپی ١٩٨١
١٦ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٥٠) چاچی ١٩٨١
١٧ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٦٢) چاپی ١٩٨١
١٨ – هەمان سەرچاوەی پێشو لا (٦٣) بە کورتی چاپی ١٩٨١
١٩ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لا ٢٠ چاپی ١٩٨٠
٢٠ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لا ٢٥ چاپی ١٩٨٠
٢١ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لا ٢٧ چاپی ١٩٨٠
٢٢ – دوبزوێن لە پاڵ یەکدا نایەن ئەگەر هاتن ئەوا یەکێکیان تێدەچێ یاخود دەنگەکە دەگۆڕێ بۆ دەنگێکی تر یان نیمچە بزوێن دەچێتە ناوانەوە .
٢٣ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لا ٤٧ چاپی ١٩٨٠ هەولێر
٢٤ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لا ٤٩ چاپی ١٩٨٠ هەولێر
٢٥ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لا ٥٠ چاپی ١٩٨٠ هەولێر
٢٦ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی ٥٤ چاپی ١٩٨٠ هەولێر
٢٧ زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لا ٥٨ چاپی ١٩٨٠ هەولێر .
٢٨ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی هەولێر چاپی ١٩٨١
٢٩ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی لا ٢٦ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٠ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی لا ٤٤ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣١ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی لا ٥٢ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٢ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی لا ٥٥ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٣ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی لا ٥٨ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٤ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ٦٢ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٥ – زمامو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پینجەمی ئامادەیی لا ٢٦ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٦ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پینجەمی ئامادەیی لا ٢٨ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٧ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی لا (٣١) چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٨ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پینجەمی ئامادەیی لا (٣٤) چاپی ١٩٨١ هەولێر
٣٩ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پینجەمی ئامادەیی لا (٣٥-٣٦)چاپی ١٩٨١ هەولێر
٤٠ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پینجەمی ئامادەیی لا (٤٧) چاپی ١٩٨١ هەولێر
٤١ – ئەم لێکدانەوەیە لە قۆناغی چوارەمدا پۆلی چوارەی ئامادەیی باسی لێوە کراوە
٤٢ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی لا ٧٢ چاپی ١٩٨١ هەولێر
٤٣ – زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ژمارە (٢) هەولێر چاپی پینجەم ١٩٨١
٤٤ – زمامو ئەدەبی کوردی چاپی پێنجەم لا (١٥) ١٩٨١
٤٥ – هەمان سەرچاوە لا (١٥)
٤٦ – کورتەیەك دەربارەی مۆرفۆلۆژی زمانی کوردی د .فاروق عمر صدیق لا (١٠)
٤٧ – زمانو ئەدەبی کوردی شەشەی ئامادەیی لا (٦٢-٦٤) ئاوەڵفرمان ١٩٨١
٤٨ هەمان سەرچاوە لا (٧٥
٤٩ – گۆڤاری کۆری زانیاری عێراق دەستەی کورد بەرگی حەوتەم لە لاپەرە (١٦٢ هەتا ١٩٥) ساڵی ١٩٨٠ مامۆستا محەمەد مەعروف فەتاح لەم بارەیەوە باسێکی نوسیوە بە نێوی «خۆیەتی لە زاری سلیمانیدا

# قانوونی چاودێری کۆمەڵایەتی
# ژمارە (١٢٦)ی ساڵی ١٩٨٠

## لقی یەکەم
### مەڵبەندی دەست نیشانکردنی پەککەوتن

**ماددەی – ٥٢ –**

مەبەستی مەڵبەندی دەست نیشانکردنی پەککەوتن پێشوازیو جۆراو جۆر کردنی پەککەوتووانە بەگوێرەی سروشتی پەککەوتنەکە .

**ماددەی – ٥٣ –**

یەکەم – لیژنەیەکی هونەری بەسەرۆکایەتی بەرێوەبەری مەڵبەندو ئەندامێتی دختورێکی پسپۆر لەنەخوشیەکانی دەروونیو عەقڵی وە دختۆرێکی پسپۆری سروشتییە جارەسەرکردن وە دختورێکی پسپۆری چاوان وە دختورێکی پسپوری لووتو گوێو قورگو دوو لێکوڵەری کۆمەڵایەتیو دوو لێکوڵەری دەروونی ، لە مەڵبەندەکەدا پێك دێت .

دووەم –

أ – سەرۆکی دەزگای گشتی چاودێری کۆمەلایەتی – بە هەڵبژاردن لە وەزارەتی تەندروستییەوە دختۆرەکانی ئەندامی ناوبراو لە (یەکەم)ی ئەم ماددەیەدا دایان ئەنێت .

ب – ئەندامانی تر کە ناویان لە (یەکەم)ی ئەم ماددەیەدا هاتووە ، بە فەرمانێك سەرۆکی دەزگای گشتی – بە هەڵژاردینان لە لایەن بەرێوەبەری گشتی دایەرەی چاودێری پەککەوتووان ، دادەنرێن .

سێیەم – لەو کاتەی کە کەس نابێ بۆ تەرخان کردنی بۆ ئیش کردن لە مەڵبەندا ، بەرێوەبەری گشتی دایەرەی چاودێری پەککەوتووان لەگەڵ ئەو کەسانە کە مەرجەکانی ناوبراوی ئەم ماددەیان تێدا هەیە ، رێك دەکەوێت ، بۆ ئەوەی لە لیژنەی هونەری بۆ ماوەیەکی دیارکراو ئیش بکەن ، ئەبێ رەزامەندی وەزارەتی تەندروستی پێش رێككەوتن ، وەربگیرێت .

**ماددەی – ٥٤ –**

لیژنەی هونەری ، ئەم ئەرکانەی خوارەوە دەگرێتە ئەستۆ :

یەکەم – دەست نیشانکردنی سروشتی پەککەوتن ، دانانی چارەسەرکردنی ، دیارکردنی ئەو وەحدەی بوی رەوان دەکرێت .

دووەم – سەرپەرشتیی هونەری تەواوی وەحدە تایبەتییەکانی چاودێری کۆمەڵایەتیی پەککەوتووانو دانانی پلانو بەرنامەی هونەری بۆیان .

سێیەم – رێکخستن لەگەڵ جۆرەها لایەنی پەیوەستداد بۆ هینانەدی ئامانجەکانی چاودێری کۆمەڵایەتی .

چوارەم – سەرپەرشتکردنی هونەری راستەوخۆ لە بوارەکانی ئامادەکردنو مەشقپێکردنی کارکەران لە مەیدانی چاودێری کۆمەڵایەتی پەککەوتووان دا .

**ماددەی – ٥٥ –**

سەرۆکایەتی تەندروستی پارێزگا – دەرەوەی پارێزگا ی بەغدا – لیژنەیەکی هونەری پێك دێنێت ، ژمارەی ئەندامانی لە سێ ئەندامی پسپۆری جۆراوجۆر کەمتر نەبێ بە ئەرکی لیژنەی هونەری ناوبراو لەماددەی – ٥٣– ی ئەم قانونەدا هەڵئەستێت .

**ماددەی – ٥٦ –**

بەرێوەبەر ، کە سەرۆکی راستەوخۆی کارکەرانە ، مەڵبەند بەرێوەدەباتو گشت فەرمانو بریارەکان بەناوی ئەوەوە دەردەچێت ، بریارەکانی لیژنەکانی هونەری جێبەجێ ئەکات وە لەمەش ژمارەیەك لە فەرمانبەران و کریکاران یارمەتی ئەدەن .

## لقی دووەم
### مەڵبەندی چاودێریی پەککەوتووانی لەش

**ماددەی – ٥٧ –**

مەبەستی مەڵبەندی چاودێریی پەککەوتووان لە لەشەوە ، شایستەکردنی ئەو پەککەوتووانەیە کە هەندێ توانای کارکردنیان هەیە ، ئەمەش بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتیو تەندرستیو پەروەردەیی ، بۆ ئەوەی تێکەڵاو بوونیان لەناو کۆمەڵدا ئاسان بێت ، وە بۆ ئەوەی بەگوێرەی توانای لەشی

خۆیان بەشداری بنیاتنانی کۆمەڵی سوشالیست بکەن .

**ماددەی – ٥٨ –**

لیژنەیەکی هونەری سەرپەرشتیو ئاراستەی سیاسەتی مەڵبەند دەکاتو جیٚبەجیٚ کردنی بەرنامەکانی بەسەر دەکاتەوە ، بەسەرۆکایەتی بەڕێوەبەری مەڵبەندو ئەندامێتی گشت سەرۆك وەحدەکانی سەر بەمەڵبەندو دختۆرێکی شارەزای لووتو گوێو قورگ کە وەزارەتی تەندروستی هەڵیان دەبژێرێت ، وە لیپرسراوی لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتیو لیپرسراوی ئاراستەکردنی پیشەیی لە مەڵبەندەکەدا ، پێك دێت .

**ماددەی – ٥٩ –**

وەحدەکانی چاودێری ، وەك ئامۆژگای شایستەکردنی پیشەیی (معهد التأهيل المهني) لە وەزیریەو ئامۆژگای الأمة (معهد الامة) بۆ کەرو لالان ، وە ئامۆژگاکانی ١٧ی تەمووز (معاهد ١٧ تموز)و وە ئامۆژگای شایستەکردنی پیشەیی لە نەینەوا ، وە ئامۆژگای بەعث (معهد البعث) لە ئەنبار ، وە هەر وەحدەیەکی ترکە لە پاشەڕۆژدا بڕیاری دامەزراندنی دەدرێت ، بە مەڵبەندی چاودێری پەککەوتووان بە لەش دا دەبەسترێنەوە .

## لقی سێیەم
## مەڵبەندی چاودێریی پەککەوتووان بەنەخۆشیی عەقڵو دەروونییەوە

**ماددەی – ٦٠ –**

مەبەستی مەڵبەندی چاودێریی پەککەوتووان لەلایەنی عەقڵو سایکۆلۆژییەوە ، چاودێریکردنی ئەو پەککەوتووانەیە کە باری نائاسایی ژیریان پێوەدیارە وە ئەوانەی لە عەقڵدا پاشکەوتوون وە ئەوانەی تووشی نەخۆشییەکانی عەقڵو حالەتەکانی شلەژاویی سایکولوژی بوون .

**ماددەی – ٦١ –**

لیژنەیەکی هونەری ، سەرپەرشتیو ئاراستەی سیاسەتی مەڵبەند دەکاتو جیٚبەجیکردنی بەرنامەکانی بەسەردەکاتەوە بەسەرۆکایەتی بەڕێوەبەری مەڵبەندو ئەندامەیتی گشت سەرۆك وەحدەکانی سەر بە مەڵبەندو دختۆرێکی پسپۆری نەخۆشییەکانی عرقلیو عەصەبی کە وەزارەتی تەندروسی هەڵیان دوبژێرێت . وە لێکۆڵەری سایکۆلۆژیو لیپرسراوی لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتیو لیپرساوی ئاراستەکردنی پیشەیی لە مەڵبەندەکەدا پێك دێت .

**ماددەی – ٦٢ –**

یەکەم – وەحدەکانی چاودێری ، وەك ئامۆژگای رجاء (معهد الرجاء) وە پۆلەکانی پەروەردەی تایبەتو ئەو وەحدانەی کە لە دوا رۆژدا بڕیاری دامەزراندنی ئەدرێ ، بە مەڵبەندی چاودێری پەککەوتووان لەلایەنی نەخۆشیی عەقلو نفسییەك دەبەسترێنەوە دووەم – پەککەوتووانی نەخۆشیی عرقلو نەفسی کە ئێستا سەر بە ئامۆژگای ١٧ی تەمووزو هەر دوو ئامۆژگای شایستە کردنی پیشەیین لە وەزیریەو نەینەوا دا بەم مەڵبەندە دەبەسترێتەوە .

## لقی چوارەم
## مەڵبەندی چاودێریی کوێران

**ماددەی – ٦٣ –**

مەبەستی مەڵبەندی چاودێریی کوێران ، شایستەکردنی کوێرانەو پێشکەشکردن خزمەتگوزاریی کۆمەلایەتیو تەندروستیو پەروەردەیی یە بۆیانو ئاسانکردنی تێکەلاوبوونیانە لە کۆمەڵدا .

**ماددەی – ٦٤ –**

لیژنەیەکی هونەری سەرپەرشتیو ئاراستەی سیاسەتی مەڵبەند دەکاتو جیٚبەجیٚکردنی بەرنامەکانی بەسەردەکاتەوە ، بە سەرۆکایەتی بەڕێوەبەری مەڵبەندو ئەندامیەتیی گشت سەرەك وەحدەکانی سەر بە مەڵبەندو بزیشکی پسپوری چاوان کە وەزارەتی تەندروستی هەڵیدەبژێرێ ، وە هەر دوو لیپرسراوی ئاراستەی پیشەییو لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتی لە مەڵبەندا پێك دێت .

**ماددەی – ٦٥ –**

ئامۆژگای چاودێریو شایستەکردنی کوێران (معهد رعاية وتأهيل المكفوفين في حي السلام) لە بەغدا ، وە هەر دوو ئامۆژگای کوێران لە بەصرەو هەولێر . . وە هەر وەحدەیەکی تر لە دوا رۆژدا بڕیاری دامەزراندنی ئەدرێ بە مەڵبەندی چاودێریی کوێران دەبەسترێنەوە .

## لەم ژمارەیەدا

